بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (د. عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص و

ئەو ئیمتیازەی هەمبوو تەحویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت بخاتە ڕزق و تجارەتیان

تجارەت ئیشی وەکاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

ناوی پەرتوک: دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان

ناوی نوسەر: عەلی باپیر

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی

نۆرە و ساڵی چاپ: 1427ك  2006ز

تیراژ: 3000 دانە

ژمارەی سپاردن ( 350 ) لە کتێبخانەی گشتی هەولێری ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

چاپکردنی بەشی دووی کتێبەکانم بە نۆرە بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لە ئێستەدا هیوادارم وا بە شێوەی چاپکردنێکی

قلیاتا بۆ بەرەخستی کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانی . جارێکی تر سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە تەوفیق و سینگی ئەم فیر و کارە هەڵگرتنی.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و لۆمەکێشان

بێت، هەنێشی سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

# پێشکەش بێ

(1)بەو کەسانەی کە ئامانجیان ڕازی کردنی خواوەند و، لادانی تەمی ڕێچکان و ، بەڕێوەبردنی ئیسلامە و، مێشکیان بە ئیسلام پاراوە و دڵیان بە خواوە بەستراوەو، لە ڕێی خوادا ماڵ و گیانیان لەسەر بەری دەست داناوە.

(2)بەو کەسانەی کە لە دەمی وتووێژدا ڕاناکەن و چاك گوێ دەگرن، کە ڕاستیشیان خرایە بەرچاو، بێ سێ و دوو وەری دەگرن.

# پێشــەکی

**الحمدلله رب العالمين و صلى الله تعالى وسلـّم و بارك على سـيّد المرسلين وخاتم النبييّن محمــد و آله أجمعين و التابعين لهم بإحسـان الى يوم الدين .**

خوێنەری بەڕێـز !

لە پێشــەکی ئەم چاپی سـێیەمی[1] کتێبی ( دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچکان) دا کە نووسینگەی تەفسـیر پێی هەڵدەستێ، بە پێویسـتی دەزانم ئەم چەند خاڵە بنووسـم :

یەکەم : ئەم کتێبە لەم چاپەی دا کت و مت وەك خۆی هێڵراوەتەوە بێجگە لە :

1- زیادکردنی چەند پەڕاوێزێکی گرنگ .

2- وردە دەسـتکارییەکی چەند ڕسـتە و تەعبیرێك .

3- ڕاسـتکردنەوەی چەند هەڵەیەکی چاپی کە لە چاپەکانی پێشـوودا هەبوون .

دووەم : کاتی خۆی کە ئەم کتێبە بۆ جاری یەکەم چاپ کــــــرا[2] . ڕەوتی مارکسـیزم و چەپگەرایی لە کوردستانی عێڕاق و بەشـەکانی دیکەی کوردسـتانیش دا لە گەرمەی گەشەو کاریگەریی و دەوری خۆ قەڵەباڵغ کردنی دا بوو. هەر بۆیەش هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە کەسانێکی زۆر بە تایبەت چینی گەنج و لاوی خوێندەوار پێی دڵخۆش بوون و تەفاعولێکی ئیجابی‌یانەیان لەگەڵ دا کرد و پێی لە تەڵەو داوی ڕێچکەی مارکسیزم و

---

(1) چونکە ئەم کتێبە جاری یەکەم لە ساڵی (1985) لە بەغدا و جاری دووەمیش لە (سـەقز)ی کوردسـتانی ئێران چاپ کراوە و ئەم چاپەش هی سـێیەمە.

(2) چاپی یەکەم پێنج هەزار (5000) دانە و چاپی دووەم سـێ هەزار (3000) دانەبوو .

کۆمۆنیزم دەرباز بوون[1]. کەسانێکیش لە پێڕو لایەنە سیاسییەکانی ئەوسادا هەبوون کە زۆری پێ‌قەڵس و نارەحەت بوون و تەنانەت لە هەندێك شوێن ژمارەیەکیشیان لێ کڕیبوو سووتاندبوویان لە داخ و خەفەتان و بۆ ئەوەش کەمتر بگاتە دەستی خوێنەران !

سێیەم :- هەرچەندە وتووێژەکانی نێو ئەم کتێبە بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر ڕوویانداوە و لەو کاتەشەوە هەتا ئێستا واقیعی دونیا بە گشتیی و عێراق و کوردستانیش بە تایبەت زۆر گۆڕاوە، بەڵام لەکاتی چاوپێداخشاندنەوەیانم دا هەستم کرد کە ئەو بابەتانەی وتووێژەکانیان لە دەوری دەسوڕێن لەو بابەتانەن کە ئێستاش بازاڕیان هەر گەرمە و قسەو باس لە بارەیانەوە هەر بەردەوامە. بۆیە دووبارە چاپکردنەوەی ئەم کێبەم بە پێویست زانی بە تایبەتیش کە ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەران بە دوای دا عەوداڵ بوون و چنگیان نەدەکەوت .

چوارەم :- کاتی خۆی  واتە سەرەتای هەشتایەکان کە وتووێژەکانی ئەم کتێبەی تێدا بوو ون  بازاڕی مارکسیزم و کۆمۆنیزم و باس و خواسی سۆشیالیزمی علیمی و ماتریالیزمی مێژوویی و ماددەی و دیالەکتیکی ... زۆر گەرم بوو و دەتوام بڵێم، ئێستاکە بازاڕی دیموکراسی و عەولەمە و زاراوەی عەلمانیەت زۆر گەرمە ئەو شتانەی ئاماژەم پێدان هێندە و بگرە گەرمتریش بوو. جا جێی سەرنج ئەوەیە کە :

(1) ئەو کاتە تەنها لە شاری سلێمانی و لە ماوەی یەك دوو هەفتەدا دوو هەزار و پێنج سەد (2500) دانەی لێ‌فرۆشرا !

ئەو کاتە کە بەندە مشـت و مڕو وتووێژم لەگەڵ هەندێك لەو برادەرانەدا دەبوو کە خۆیان بە تاکە سـواری مەیدانی کوردایەتی و عیلم و فەلسـەفە و ... هتد دەزانی و پێم دەگوتن  وەك لە دەقی وتووێژەکانیش دا هاتووە :-

باشـە کاکەگیان دیارە مارکسـیزم و سـۆشـیالیزم شتی باشـیان تێدایە بەڵام بێگومان لە هەڵە و پەڵە و کەم و کووڕیش خاڵی نین چونکە هەرچۆن بێ زادە و بەرهەمی بیروزەینی مرۆڤـن. هەروەها کاپیتالیزم (الرأسمالية) یش هەرچەندە خراپە و بەدیی زۆری تێدایە بەڵام هەرچۆن بێ هەندێك لایەنی چاکەشی هەر تێدان و نە سۆشیالیزمی ڕۆژهەڵات بەفری بێ پەڵەیە و نە سەرمایەداریێتی یەکەی ڕۆژئاواش پەڵاسی ڕەش و بڕشـە !

بەڵـێ کاتێك وام پێدەگوتن ڕقیان هەڵدەسـتا و دەماری لاملیان ڕەپ دەبوو و پێیان وابوو قسـەیەکی یەکجار هەڵە و بێویژدانانەکراوە، چونکە ئەوان ئەو سـەردەمی قەناعەتیان وابوو کە ڕۆژئاوا بە گشـتی و ئەمریکا بە تایبەت هەرچی خێرە بە نێو چەوانیانەوە نیە و، هەر کەسێك ناویشـیان بە چاکە بێنـێ کۆنەپەرسـت و نۆکەری بێگانە و ئیمپریالیسـتە !

کەچی ئێسـتا گەلێك لەو برادەرانە دەبینم هەیهوو هەیهوو سـەد و هەشـتا پلە بایان داوەتەوە و ویردی زمانیان بۆتە باس و خواس و مەدح و پێهەڵاگوتنی ئەورووپا و ئەمریکا و ڕۆژئاوا و وەك چۆن ئەو کاتە لە بابایەکی وەك بەندەیان نەدەسەلماند کە بلۆکی ڕۆژهەڵات بە گشتی و یەکێتی سـۆڤیەت بە تایبەت هیچ هەڵە و پەڵەیەك لە بیروباوەڕ و سـیاسەت و بەرنامەیان دا هەبێ و ، ڕۆژئاوا بە گشـتی و ئەمریکا بە تایبەت هیچ جۆرە خێرێکیان پێوە بێ ! ئێسـتا ڕاسـت بەراوەژووەوە پێیان وایە ڕۆژئاوا بە گشـتی و ئەمریکا بە

تایبەت لە هەرچی هەڵە و کەموکووڕی یە دوورە و سـەرتاپا خێر و بەرەکەت و نوورە !

هەڵبەتە ئە هەڵوێستە سەیر و نامەتیقی یەی ئەو جۆرە کەسانەش لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە خاوەنی زەمینەیەکی فیکریی پتەوی وا نین کە لەسەری بوەستن و لەو هەموو هەڵداو پێداو بەرەو ڕاست و چەپ چوون و تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط و تفریط) بیانپارێزێ و، دڵنیا دڵنیاشم کە ڕۆژێك دێ - زوو یان درەنگ  لەم هەڵوێستەی ئێستاشیان پەشێمان دەبنەوە و لەو حاڵەی ئێستاشیان پاشگەز دەبنەوە، بەڵام جارێ نازانم ئەمجارە بەرەو کوێ دەچن و بۆ کام لا وەردەسووڕێن و بادەدەنەوە !!

ئەگەرنا تۆ وەرە تێفکرە ! بزانە هیچ جۆرە مەنتیقێك لە هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانەدا دەبینی کە هەندێکیان لە سەرکردایەتی سیاسی کوردیش دا هەن لە بەرانبەر ئەمریکادا کە بە هیچ شێوەیەك ڕێگا بە خۆیان و ڕاگەیاندنە حیزبیەکەشیان نادەن لە بەرانبەر ئەو هەموو هەڵوێست و سیاسەتە ئیمپریالیستیی و هەلپەرستانەی‌دا متەق بکەن و قسەیەك بکەن، لە حاڵێك دا کە هەموو دنیا ڕەخنە دەگرێ و ناڕەزایی دەردەبڕێ و هەرا هەرا دەکات و خۆپیشاندان و ڕێپێوان ساز دەکات دژ بە ئەمریکا و سیاسەت و هەڵوێستە چەوتە ئیمپریالیستی یەکانی کە بە زیان و زەرەری گەورە گەورە دەشکێنەوە بەسەر گەلانی جیهان و گەلی ئەمریکا خۆیشی دا و بگرە بەسەر گیانداران و ڕووەك و ئاو و هەواو ژینگەش دا[1] !

---

(1) تا ئێستا ئەمریکا سەرپێچی و لاملیی کردوە لە پابەندیی بە چەندان ڕێککەوتن نامەی نێو دەوڵەتی یەوە کە سەرجەم وڵاتان و دەوڵەتانی دنیا لەسەریان پێکهاتوون، بۆ وێنە : دروست نەکردنی مین (لغم)، وە کەمکردنەوەی کارکردنی ئەو کارگانەی دووکەڵ و گازەکەیان هەوا پیس دەکات و چینی ئۆزۆن (طبقة اوزون) تەنك دەکات و ..... هتد .

بگرە هی وایان هەیە بە جۆرێك ڕەفتار دەكات كە لە ئەمریكاش ئەمریكاتر دێتە بەرچاو و پەندی : ( كاسـە لە چێشت گەرمتـرە ) ی بەسـەردا دەچەسـپێ !

بۆ نموونـە :-

ئەمریكا بێپەردەو بەڕاشـكاویی و بە ڕەسـمی ڕاگەیاندوە كە هاتوە عێراقی داگیـر كردوەو و ناوی لە خۆی ناوە : (داگیـر كەر) كەچی لەو جۆرە برادەرانە هەیە كە لە زای ڕانایەت. بۆ تەنها جارێكیش ئەو ناوەی كە ئەمریكا بێئەوەی شـەرم بكات لە خۆیناوە، لێی هەڵبدات[1] !

پێنجەم :- شـایانی باسـە كە بەندە جگە لەم كتێبە لە چەند كتێب و بەرهەمێكی دیكەشـم دا هەڵسـاوم بە بەرپەرچدانەوە و پووچەڵكردنەوەی تۆمەت و قسـەو قاڵی كەسـانێك كە خۆیان بە بێبڕوا و ناحەزی ئیسـلام پێشـانداوە، جا بە پێویسـتی دەزانم بۆ بەرچاو ڕوونـی ئەو گەنج و لاو و خوێندەوارانەی بە دوای ئەو جۆرە باس و بابەتانەدا دەگەڕێن ئاماژەیەكیان پێبكەم :

1- سۆزی نەتەوایەتی كە ئاڵقەی چوارەمی زنجیرە وتوویژی ئیسلامو ڕێچكان ە.

---

(1) دەگێڕنەوە ڕۆژێك (دەروێش) ێكی زۆر دەمارگیر (متعَّصب) بۆ شـیخەكەی ئیددیعای ئەوە دەكات كە شـێخی دیوە بە عاسـمانێدا فڕیوە ! جا كاتێك لـە شـێخ دەپرسـن و ئەویش ئینكاریی ئەوە دەكات كە فڕی بێ و دەچنەوە لای دەرویش و دەڵێن : شـێخ وای فەرمووە ! دەڵـێ : شـێخ سـەهووی كرد، چۆن نەفڕیوە !! جا هەڵوێسـتی ئەو جۆرە كەسـانەشم لـەگەڵ دەوڵـەتی جیهانخۆری ئەمریكادا وەك هی دەروێشـەكە لـە بەرانبەر شـێخەكەی دا دێتـە بەرچـاو !

2- خواناسیی ، ئایین ، ئیمان : ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و ئەفسانەکانی ڕێکچان دەپووچێنەوە.
3- مسولْمانی کامڵ ، بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسولْمان .
4- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم : تیرۆر ، مافی مرۆڤ ، سیکۆلاریسم ، جیهانگیریی ، دیموکراسی .
5- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا .

کە لە یەکەمیان دا هەوڵدراوە هەڵوێستی ڕاست و دروستی ئیسلام بەرانبەر بە بابەتی نەتەوایەتیی و نیشتیمانپەروەریی بخرێتە ڕوو و سەرجەم ئەو تۆمەتانەی کە لەو بارەوە ئاڕاستەی ئیسلام دەکرێن بەرپەرچ بدرێنەوە.

دووەمیشیان زۆر بابەت و مەسەلەی تێدا خراونە ڕوو، بە تایبەت مەسەلە و باسەکانی پەیوەست بە بڕوا بە خوابوون و (ئایین) ی تێدا توێژراونەوە و وێڕای بەڵگە هێنانەوەی ژیرییانە و زانیارییانە لەسەر بەدیهێنرایەتی خوا ( سبحانە و تعالی )، بەرپەرچی هەموو ئەو بیردۆزە و بۆچوونە بێبڕوایانەش دراوەتەوە کە باسی هۆکار و چۆنیەتی پەیدابوون و سەرهەڵدانی (ئایین) یان کردوە.

لە سێیەمیشیان وێڕای بەڵگەهێنانەوە لەسەر پەروەردگاریێتی خوا (جلّ شأنە) . باسی ڕۆژی دوایی و پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و قەزا و قەدەریش کراوەو هەوڵدراوە کۆمەڵێك تۆمەت و ئیشکال کە لە بارەی هەر کام لەو پایە و بنەڕەتانەی عەقیدەی ئیسلامییەوە دەخرێنە ڕوو بەرپەرچ و وەڵام بدرێنەوە.

له چوارەمیشیان دا هەر توانیومانە کام لەو پێنج مەسەلەیەی کە ناوونیشانەکانیان باسکراون لە ڕوانگەی عەقلّ و (نقل) ەوە بتوێژینەوە و هەق و ناهەق و پاك و پیس لە یەکتری جیا بکەینەوە وە لە پێنجەمیشیان[1] دا زۆربەی ئەو بابەت و مەسەلانە توێژراونەوە کە ناحەز و نەیارانی شەریعەتی پڕ لە داد و بێ هەڵەی خوای پاك و بێ پەڵە سبحانە وتعالی لە بواری ئافرەت و خێزان دا دەیانوروژێنن و بە خەیاڵی خۆیان مایەی تۆمەتبارکردانی ئیسلامن .

ئنجا خوا پشتیوان بێ ئێستاکەش کتێبێکم لەبەردەستە و خەریکی ئامادەکردنم بۆ چاپ ، لە بواری حوکم و سیاسەت و بنیاتنانی دەوڵەت و قەوارەی سیاسی لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، کە پێم وایە دەبێتە مایەی کردنەوەی گەلێك گرێ کوێران و ڕەواندنەوەی تەمی زۆر گومان و ئیشکالان لە دلّ و مێشکی کەسانێك دا کە عەودالّی هەق و ڕاستین .

ئومێدیشم وایە و لە خوای بەخشەریش (جلّ و علا) دەپاڕێمەوە کە ئەو بەرهەمانەو سەرجەم بەرهەمەکان دیکەش بەرەکەت و هێز و پێزی ئەوەیان هەبێ کە ببنە مایەی بەرچاو ڕوونبوونەوەو ڕێی ڕاست دۆزینەوەی گەنج و لاوەکانمان کە بە داخەوە و سەد حەیف و مخابن لە زۆر لاوە کاری جیددی دەکرێ و هەوڵی شێلگیرانە دەدرێ کە لە خشتە ببرێن و لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دوور دەخرێن !

بێخەبەر لەوە کە دینداریی ڕاستەقینە بناغەی دنیاداریی سەر ڕاستانەیە و (دین) هەوێنی (ژین)ەو (ئیمان) یش ڕووح و هەناوی (ئینسان)ە .

---

[1] بەرگی یەکەمی تا ئێستا دووجار لە لایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوە و ، خوا یاربێ بەرگی دووەمیش هەر دەرفەت بێ ئامادەی چاپ دەکرێ .

وەك خوى زاناو پەنهانبين فەرموويەتى :

﴿ وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ، صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ أَلاَ إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأُمُورُ ﴾ (الشورى 52 – 53)

واته : ئاوا بەو شێوەیە (ئەی موحەممەد !) ڕووحێکمان لە ئایینی خۆمان بۆ تۆ نارد. کە پێشتر تۆ نەتدەزانی نە کتێب چی یە نە ئیمان . بەڵام ئێمە قورئانمان گێڕاوە بە ڕووناکییەك کە هەر کەسێك بمانەوێ لە بەندەکانمان پێی ڕێنمایی دەکەین . وە بێگومان تۆ □ خەڵکی □ بەرەو ڕاستەڕێ ڕێڕوونیی دەکەی. ڕێی خوایەك کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هی ویە. ئاگاداریش بن ! کاروبارەکان تێکڕا بەرەو لای خوا دەچنەوە.

ئومێدەیشم وایە کە هۆشیاریی و بێداریی گەنج و تازە پێگەیشتووەکانمان بەهێزتر بێ لە پیلان و نەخشەی پیلانگێڕانی دڵنەخۆش و ئاشکراشە کە هەرکەسێك بەڕاستی ڕوو لە خوا بکات و پشتی پێ ببەستێ خوای بەبەزەیی و میهرەبان دەستی دەگرێ و لە فریای دێ و زایەی ناکات . وەك فەرموویەتی :

﴿ اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ (البقرة 257)

واتە: خوا دۆست و پشتیوانی ئەوانەیە کە بڕوایان هێناوە ، لە تاریکاییەکان دەریان دێنێ بەرەو ڕووناکی □ دەیانهێنێ -، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان دۆست

و پشـتیوانیان طاغووتەکانن کە لە ڕووناکی یەوە بەرەو تاریکاییەکانیان دەبەن ، ئەوانە هاوەڵانی ـ ئاگر- ی دۆزەخ- ن ـ بە هەمیـ شـەیی تێ ـیدا دەمێننەوە.

خوایە بە لو طف و بەخشش و چاکەی بێوێنەو بێ سـنووری خۆت ـ لەو کەسانەمان بگێڕی کە شـایسـتەیی ئەوەیان هەیە بۆ خۆت سـەرپەرشـتی ـیان بکەی و مشـووریان بخۆی و دۆسـت و پشـتیوانیان بی .

23 صفر 1427

2006 / 3 / 23

هـەولێر

# چەند تێبینیەکی گرنگ

یەکەم: یەکەم جار ئەم زنجیرەیەم ناو نا : (ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیسلام و ڕێچکان)، دوایی ئەو ناوەم گۆڕی و کردمە : (لە ڕاستیێکرِاهاتنی ئیسلام و ڕێچکان)، ئینجا ئەو ناوەشم گۆڕی و کردمە: (مل ملانێی هەق و ناهەق) لە کۆتایی دا ئەویشم گۆڕی و ناوم نا: (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان) وە مەبەستیشم لە (هەق) بەرنامە و پەیڕەوی خودایە و، بە وشەی (ناهەق)یش هەموو ئەو بیرو بۆچوون و ڕێچکانەم مەبەستن کە زادەی بیرو زەینی ئینسانن.

دووەم: بە مەبەستی پێهەڵابردنی ئاستی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردیمان، هەوڵم داوە بە پێی (توانا) گەلێك وشە و زاراوەی وا بەکار بێنم کە لە یەکێك یان زیاتر لە ناوچەکانی کوردستانی بەرین دا بەکاردێن. جا خوێنەری سەنگینم ئەگەر هاتو بڕێك وشە و زاراوەی گران و نامۆت هاتنە بەرچاو، نیگەران مەبە و سەرنجێکی فەرهەنگیلەی ئەم کتێبە بدە خوا یار بێ نائومێدت ناکات، خۆ ئەگەر بشتوانی بەر لە خوێندنەوەی وتووێژەکان سێ چوار جا بە وردی فەرهەنگیلەکە بخوێنیەوە، تێگەیشتنی وتووێژەکانت بۆ سێناتر دەبێ.

سێیەم: لەهەر جێیەك زانییم مەسەلەیەك لە نێو دەقی وتووێژەکان دا بە چاکی نەتوێژراوەتەوە، لە پەراوێزدا بە پێی توانا و بۆ لوان قسەم دەربارە کردوە، کەواتە ئەوەی لە پەراوێزەکان دا نووسراوە، لە دەقی وتووێژەکان دا نەبووەو، دوایی زیاد کراوە، هەڵبەتە بۆیەش ئەو باسە زیاد کراوانەم

خستنه پەراوێزەکانەوە، چونکە هەرکام لە ئالقەکانی ئەم زنجیرەیە ئەگەر سـەرلەبەریشی ڕووداوو واقیعی نەبێ بەشـی هەرە زۆری واقیعـی یە و، نەمویست بەهۆی دەسکاری کردنەوە تام و چێژی واقیعی وتووێژەکان بڕوات.

چوارەم: بەرلەوەی دەست بە نووسینی ئەم زنجیرەیە بکەم دەمزانی کە هەندێك لە برایانی موسڵمان بە پەسندی نازانن مرۆڤی موسڵمان دەربارەی ئەو جۆرە بیرۆچکانە بنووسێ بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکیان بۆلا ڕانەکێشرێ و هەر بە مەلۆتکەیی شەوەی گوێ پێ نەدان و بە کەم سەیر کردن بیانباتەوە، بەڵام بۆیە ڕای وانم بە ڕاست نەزانی چونکە ئەو بیردۆزە و ڕێچکانە لەو قۆناغە هەڵبردوون کە هەر مەلۆتکە بن و بە گوێ پێ نەدان و خۆ لێ وەخەبەر نەهێنان لە نێو بچن، بەڵکو ئەمن پێم وایە ئەو کەسەی وا دەزانێ ئەو بیردۆزە و ڕێچکە دەسکردانە بەس بەخۆ لێ کەڕ کردن و گوێ پێ نەدان دەپووکێنەوە و قرەواریان لێ دەبڕێ، وەك حوشترمەل بیر دەکاتەوە، کە دەڵێن لە دەمی دیتنی ڕاوچی‌دا سەری خۆی لە لمی دا قم دەکات و پێی وایە ئەگەر ئەم ڕاوچی نەدی، ئەویش ئەم نابینێ !!

بەڵێ لە ڕاستی دا ئەو ڕێچکە پووچە دەسکردانە وەك بڕاریکی فراژووبوو و پنج گرتوو وان، کە نەهێشتنی حەوجێی هەڵکێشانە بە بڕاربڕێکی بڕندە و تیژ، کەواتە با بە بڕاربڕی ژیری و زانیاری لە هەڵکێشان و ڕیشە کێش کردنی ڕێچکە و بیردۆزە پووچە زیانبەخشەکان وەخۆ بکەوین و زەوی بیروهۆش و دڵ و دەروونی فریودراوو لە خشتە براوەکانمانیان لێ پاك بکەینەوە.

# پێشەکی چاپی یەکەم

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

لەوەتی خوا دنیای داناوە و مرۆڤی لەسەر زەوی بە جێ نشینی خۆی ڕۆناوە، گێرە و کێشە و مل بە ملە، لە نێوان هەق و ناهەق دا هاتۆتە گۆڕێ و مێژووی مرۆڤایەتی ئەوەندە ڕەنگی ئەو مل بە ملەی گرتوە و شەقڵی وی لێدراوە، دەتوانین بڵێین: سەرانسەری بریتییە لە کێشەی نێوان هەق و ناهەق.

جا لەبەر ئەوەی هەندێك مرۆڤ ئەوەندەی بۆیان کرابێ بە ئەرکی جێنشینایەتی هەستاون و لە چەمکەکەی گەیشتوون و تامی هەق ویستی یان چێشتوە، کە دیتووشیانە خزم و کەس و هاوزمانیان لە تام و چێژی هەق و هەق خوازی بێ بەشن و مێشکیان بە بیروباوەڕی پووچ بەنج کراوە و بە ڕاستی دەزانن، چاویان بەرینایی نەداوە، ئەو حەشاماتە سەری لێ تێکچێ و لاڕێ بێ..لەبەرئەوە قیروسیایان لە خۆشی ژیان کردوە و دەستیان کردوە بە خستنە ڕووی هەق و ڕاستی بە گوتار و کردار، هەڵبەتە ئەوەشیان گران لەسەر وەستاوە، چونکە ڕوون کرانەوەی هەق و دەکار خرانی لە نێو خەڵکدا، دەبێتە لەمپەر لە ڕێی بەرژەوەندی ئەو کەسانەدا، کە بناغەی لرف لێدان و شاتوشووتیان لەسەر بێ ئاگایی خەڵك دامەزراوە..جا لەبەر ئەوە ئەو خۆپەرستە مرۆڤ خۆرانە ئەوەندەی پێیان کرابێ لە بەربەرەکانی کردنی هەق دا درێغی یان نەکردوە و خۆیان نەگنخاندوە.. هەڵدانەوەی ڕووپەڕەکانی مێژووی کۆن و نوێ ڕاستی ی ئەو مەسەلەیەمان بە ڕوونی دەخاتە پێش چاوان...

وەرە با لوێچێك لە خەرواری مێژووی مرۆڤایەتی بدەین، بزانین چ باسە:

مووسا ڕاسپێرراوی خوایە و پەیامی ئازادی و بەختیاریی بۆ خەڵکی میسر پێیە و، دەیەوێ لە زەلکاوی بت پەرستی دەریان بێنێ و بیان گەیەنێتە ئاسمانی خواپەرستی ، کەچی ناهەق و خراپە لە ستەمکارێکی وەك فیرعەون دا خڕ دەبێتەوە و دەبێتە پەرچی سەر ڕێی مووسا، هەڵبەتە ئەو هەڵوێستەی فیرعەونیش شتێکی ئاسایی و چاوەڕوان کراوە، چونکە ماقووڵ نیە فیرعەونێك کە خۆی بە گەورەترین پەروەردگاری گەلەکەی دەزانێ، ڕازی بێ شوانێکی چەوساوەی، لێ ڕاست بێتەوە و پێی بڵێ : تۆش مرۆڤێکی وەك ئەو خەڵکەی و هیچت لەوان زیاتر نیە، هەر بۆیەش کە زانی خەریکە کار لە کار بترازێ، ویستی بەری ئەو ڕووناکی یە بگرێ کە کەوتبوە سەر زەوی میسر و هەرچی جادووگەری هەیبوون لـێی کۆکردەوە، تا بە پڕوپاگەندەی درۆ دڵی خەڵکی لێ کرمێ بکات و باوەڕی پێ نەکەن.. بەڵام لە ئەنجام دا هەر ڕوو زەردی بۆ مایەوە و لە دەبەرڕاچوونی هەق دا پشتی وەعەرزێ کەوتوو بوو بە بەردی بن گۆمێ.

بەڵێ هەر لەو کاتەوە پێداوەرە تا ئێستا، دەبینی هەمووی دەبەرڕێك ڕاچوونی هەق و ناهەقە و، ناهەق کە تەنگی پێ هەڵدەچنرێ و ئێچکی لێ وێك دێتەوە، لە هیچ جۆرە درۆ و بوختان هەڵبەستنێك ناپرینگێتەوە بۆ لەکەدار کردنی هەق و ڕاستی..ئەوەتا هەموو زلەزلەی قورەیشیان خڕ دەبنەوە تا شتێکی وا وەبینن محمد ﷺی پێ بەد ناوو تاوانبار بکەن و جارێك پێی دەڵێن: شاعیرێکی شێتە و جارێك پێی دەڵێن: کاهینە و جارێك جادووگەر... ئینجا

که ئەو تیرەشیان نیشانەی نەپێکا، ڕەشەبای قین و دڵرەشی پاڵی پێوەنان دوا چەکی خۆیانی لێ بخەنە کار : زەبر و زەنگ و چاو لێ سوور کردنەوە و تۆقاندن.

بەڵام ئاخیری ئەوەش دادی نەدان و هەق هەروەك پشکۆی بن خۆڵەمێش بە شەماڵی هەق پەرست و مرۆڤ دۆستان گەشایەوە و ناهەقیش باروبارگەی خۆی بەرەو سەر گوێلکی مێژوو و تاریکایی ڕقی خەڵك و خوای مەزن پێچایەوە.

بەڵێ ، جا ئەوە دەستووری خوایە کە بۆ سروشت و ژیانی مرۆڤی داناوە و دەستووری خواش هەموو ڕۆژێ لە گۆڕێ دایە و، دووبارە دەبێتەوە و هەرگیز تەپ و تۆزی گۆڕانی لێ نانیشێ، ئێستاش کە سەدەی بیستەمە، ئەو دەستوورە هەر لەکار دایە و دەبینین شوێنێك لەم دنیا پان و پۆڕەدا نیە کە نەبووبێتە مەیدانی پێك هەڵپڕژینی هەق و ناهەق و دەبەرێك ڕاچوونیان.

لە کوردستانەکەی مەش دا هەر هەمان تاس و حەمامە و، هەق و ناهەق ملیان دەبەر ملی یەکدی ناوە و هەریەکەیان لەوی دی دەخەفتێ، هەق و ناهەقیش ئێستا لە وڵاتی مە، لە ئیسلام و ڕێچکە مرۆڤ کردەکان دا خۆ دەنوێنن.

ئەو ڕێچکانەی ئێستا لە کوردستان پەیدا بوونە و، هەریەکەیان خۆی بە دەمڕاست و مشوور خۆری گەلی کوردمان دەزانێ و بە حسێبی خۆی تێلەکەی خەون و خەمی کوردانی لە پشتێ ناوە بەرەو هەواری ئازادی و بەختیاری !!

بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی تێوەڕامان و وردبوونەوەیە، ئەوەیە کە سەرەڕای بێ سەرە و بەرەیی و خۆخۆری ئەو ڕێچکانە و نەگونجانیان لەگەڵ ئیسلامەتی و سروشتی گەلی کورددا، بە فراوانی پەرەیان ستاندوە، بەڵام حەتمەن (ئەو ماستە

بێ موو نیە) و چەند هۆیەك هەن برەویان بە وان ڕێچكان داوە، كە ئەم سێ یەیان زۆر بەرچاون:

1- چەوساوەیی و بێ سەرەوبەرەیی ژیانی نەتەوەكەمان.

2- دواكەوتوویی نەتەوەكەمان و هەژاری فەرهەنگی لە كوردستان دا.

3- ڕانەنواندنی ئیسلام لە كوردستان دا بە شێوەیەكی ڕاست و كورت هەڵهێنانی لە نێو جوغزی دروشمەكان و هەندێك كردەوەی چاك دا، بەوەش مەیدان بۆ ڕێچكان چۆڵ بووە، چونكە "ئەگەر پیاو لە گۆڕێ‌دا نەمان بە كەڵەبابی دەڵێن میرقاسم!".

كەواتە ئەی كوردی هاوزمان و و خۆشەویستم !

با پەردەی بێدەنگی و خامۆشی زیواڵ زیواڵ كەین و، با بگەڕێینەوە سەر بەرنامەیەك كە زاتێك داینـاوە زانیاری‌یەكەی سنووری نیە و ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی لەبەرچاوە و، لە هەموو كەس چاكتر دەزانێ چ لە مرۆڤ دەوەشێتەوە و دەیگەیەنێتە ئامانج.

بەرنامەیەك كە بەر لە لایەنگرانی ناحەزانی وە باڵی بۆ دەكێشن كە هەوێنی ڕزگاری یە و ڕەوێنەرەوەی تەم و مژی ژێر دەستەیی و خاكەساری یە.

جا بۆوەی پتر لێوەشاوەیی ئیسلام و دەستەوستانی ئەو بیردۆزە و ڕێچكانەت بۆ دەركەوێ بە وردی ئەم كتێبەی ئێستا بە دەستی تۆوەیە و ناوی خۆی بە خۆوەیە بیخوێنەوە، كە وابزانم تاقە كتێبێكە لە بواری خۆی دا تا ئێستا بە زمانی شیرنی كوردی نووسرابێت و بە ڕاست و ڕوونی بەرنامەی ئیسلام لە بەرانبەر ڕێچكە و كوێرە ڕێ‌یەكان ڕانوێنێ و بیسەلمێنێ كە ئەوەی دەبەر ئیسلام ڕاچێت و نیازی بەرانبەری خراپ بێ، سەری خۆی لەبەردی دەدا و

وەعەرزێ دەکەوێ و دەبێتە پەند..جا لە هەمووشی خۆشتر ئەوەیە کە کتێبەکە بەشی زۆری وتووێژەکانی واقیعین و لێرە و لەوێی کوردستان دا لە نێوان مامۆستای نووسەر و چەند کەسێکی سەر بە ڕێچکە و کوێرە ڕێ یان ڕوویان داوە و نووسەریش بە کوردی یەکی زۆر ڕەسەن و پاراوو ڕەوان بۆی تۆمار کردووین.

ئەم کتێبە سێ ئەڵقەیە لە زنجیرە وتووێژێك کە هەتا ئێستا شەشیان پاك نووس کراون، هەر ئالْقەیەك لەو ئالْقانە لە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەدوێ و بە ڕوونی ڕای ئیسلامی لە بارەوە دەرخراوە و گومانە خراپەکانی ڕێچکانیشی تێدا یەك بە دوای یەکدا، وەك بلْقی سەر ئاوێ بە بەڵگەی بەهێز و پتەو تەقێنراون و، شوێنەون کراون و لە هەموویان دا تیشکی بەهێزی ئیسلام تارمایی ڕێچکانی ڕەواندۆتەوە و بەتەنێ لە مەیدانێ ماوەتەوە، هەرچەندە زۆر جاران کابرای دەمڕاستی ڕێچکان ویستوویەتی فیسقان بکاتەوە و خۆی دەخوارە بایان بگرێ و وەك حوشتر مەل سەری خۆی دەملی هەیتوو هووتی یاری کردن بە وشان ڕاکات، بەڵام سەرەنجام هەر سەتحی و سەرسام بووە و زاری بۆتە تەڵەی تەقیو..

پێشینانمان گوتوویانە: "بیستن وەك دیتنێ نیە."، ئەمنیش هەتا بەم کتێبە بە نرخ و نایابەی هەڵابڵێم لـێی نابمەوە و ئێوەش تامەزرۆییتان ناشکێ، بۆیە حەواڵەی کتێبەکەتان دەکەم و هـیوادارم بە دوور و درێـژی ئەو ڕاستی یانەتان بۆ وەدەرکەون.

**لە کۆتایی دا :**

**هیوادارم کە مامۆستای نووسەر خوا دەست بە عومریەوە بگرێ و بیری هەروا مووقەلێش و ، قەڵەمی هەروا تیژ ڕاگرێ، بۆ ئەوەی بەردەوام چاوی مسوڵمانان بە تیشکی وشەی کوردی درەوشاوە بە ڕووناکی ئیسلام ، ڕوون بکاتەوە و بڕوایان زیاد کات و، ئارامی و ئۆخژنیان بخاتە هەناوان و لەسەر پێشکەش کردنی بەرهەمی وا بە کەڵك، هەر بەردەوام بێ و دێوەزمەی بێ تاقەتی و ماندوویەتی وەك بەزاندوە هەر ببەزێنێ‌و، ئامێزی وشەی پاراوی کوردی لە بەژنی کەڵەگەتی ئیسلام وەرێنێ و گرچووی ئەوانە بتەزێنێ، کە بە هەویان وشەی کوردی بە زەلکاوی ڕەشی شەرمەزاریدا بەرنە خوارێ و بیکەنە خزمەتکار و دەلاڵی ماڵەمیرانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و بە چەکوچ و داس ملی هەڵبڕن و سەری بەرزی بە نیازی دانەواندن بکوتن ! وە بە هەموو کەسی بسەلمێنێ کە وشەی زاری صەلاحەددین و نەوڕەسی هەر پەروانەی دەوری چرای ئیسلام دەبێ.**

**ڕێبوار کوێستانی**





## ئەڵقەی یەکەم

## وتوویژی یەکەم: سەلماندنی هەبوونی خوای مەزن

**کـات:** 5 / 4 / 1982 ز

**شوێن: شاری (سەردەشت) چاخانەی (حیکمەت)**

..دووەم کەڕەتم بوو بچمە شاری (سەردەشت) لە چاخانەی (حیکمەت)دا بە مەراقەوە دانیشتبوم، سەرنجم دا لە لای ڕاستمەوە کوڕە جحێڵێکی کورد دانیشتوە و کتێبێکی بە دەستەوەیە، سەرگەرمی موتاڵا کردنیەتی، لـێ ی ورد بوومەوە لەسەر بەرگەکەی نوسرا بوو (جهان بینی مادی)، واتە: بوونەوەر لە ڕوانگەی ماتریالیزمەوە، دوای سەلام عەلێك و چاك و چۆنی بەم جۆرەی کە بۆتان دەگێڕمەوە دەستمان کرد بە وتووێژ:

+ دادەی ئەگەر زەحمەت نەبێ با سەیرێکی ئەو کتێبە بکەم، ئەوە دەربارەی چ دەدوێ؟! دەبێ بشم بەخشی؛ ئەرێ خۆ بابای ئاشقە کتێب حەز دەکا هەر کتێبێکی دیتی بیناسێ.

 ئەم کتێبە سەبارەت بە چۆنیەتی دروست بوونی بوونەوەر و ژیان و مرۆڤ دەدوێ لە ڕوانگەی ماتریالیزمەوە.

+ بە بڕوای تۆ چ ئاست (مستوی) ێکی هەیە ؟!

 کتێبێکی زۆر عیلمیانە و بەسوودە و بە شێوازێکی عیلمیانە مەسەلەکان دەتوێژێتەوە بە بێ پەنا بردنە بەر غەیب و مەیب.

+ وا دیارە جەنابت بڕوات بەوە نیە کە خوای مەزن بوونەوەری خوڵقاندوە؟!

 (بە زەردەخەنەوە) نەخێر.

+ باشە ئامادەییت هەیە کە لەو بارەوە بدوێین تا بزانین ئەو بیروباوەڕەی تۆ تا چ ڕاددەیەك ڕاستە و لەگەڵ ژیری و زانیاریدا دانووی دەکوڵێ ؟

 بەڵێ ، فەرموو :

(وەك سەیرم کرد خەڵکی دەوروپشتمان گوێ قوڵاغ بوون و هەستیان ڕاگرتوە، تا بزانن ئەم مشت و مڕەی مە سەری بە کوێ دەگات، لەبەر ئەوە بە پەسندم نەزانی لەوێدا درێژە بە وتوویژەکەمان بدەین، چونکە:

یەکەم: زۆر نیزیك بوو دانیشتووان بەشداری یان تێدا کردبایە و بووبا بە گەڕە لاوژە.

دووەم: ئەگەر بتەوێ یەکێك ئیقناع بکەی و لە کەرێ شەیتانی بهێنیە خوارێ، پێویستە بەتەنێ لەگەڵی دا بدوێی، چونکە هەر مرۆڤێك بیگری بیروبۆچوونی خۆی پێ ڕاستە و، هیچ کەسیش نیە کە لە دڵی گران نەیەت لەبەرچاوی خەڵکی بە دۆڕاوو بەزیو بێتە دەر، هەرچەندە وازهێنان لە ڕێی چەوت و هەڵەش دۆڕاندن و بەزین نیە، بەڵکو بردنەوە و سەرکەوتنە، ئەمما کەم کەس هەن هێندە بفامن، بۆیە پێم گوت: )

+ ئێرەکانە بە گونجاو نازانم بەڵام ئەگەر بتوانی لە کات و شوێنێکی دیکەدا یەکدی دەبینینەوە.

 زۆر چاکە.

(هەر ئەوێ ڕۆژێ لە کاتی دیاری کراودا لەگەڵ (م) پێك گەیشتین، ئەو هەر وەژوور کەوت و دەستی پێ کرد نیزیکەی نیودانە سەعات زمانی لە گۆ نەکەوت، واش داگیرسابوو نۆرەی نەدەدامێ، منیش هەرچەندە قسەکانیشی سەرەڕای ئەوەی کە لە تێکەڵ و پێکەڵی و بێ سەرەو بەرەییدا چێشتێ

مجێوریان دەهێنامەوە یاد، لاوەکی و دوورە پەرێزیش بوون و کەم و زۆر لەگەڵ ئەو باسەدا کە گفتمان دابوو بۆی دانیشتین پەیوەندییان نەبوو، لەگەل ئەوەش دا لێی گەڕام و قسەکانم پێ نەبڕین، نەوەك دڵی بریندار بێ و دوایی بە هیچ کلۆجێك قسەکانم لی وەرنەگرێ، ئەگەر هەزار بەڵگەشی بۆ بێنمەوە، ئەمما کاتێك بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو گوتی: )

ئیسلامەتی کە زۆر کەس پێی وایە خوایەك ناردوویەتی و مایەی حەسانەوە و سەرفرازی هەردوك دنیای مرۆڤە، گەورەترین و پڕ مەترسیترین چەکی دەستی سەرمایەدار و ستەمکارانە بۆ چەوساندنەوەی نەداران و مژینی خوێنیان بۆ وێنە: وا لە گوێی هەژار و دەسکورتەکان دەچکێنن کە ژیانی دنیایە هیچ نیە و، هەر کەسێك خۆی پێوە خەریك کات نەفام و گێژە و ئینسان ئەو ئینسانەیە بە زگێك تێر و بە دوان برسی بێ و بۆ ڕابواردن و ژیانی بەهەشتێ خۆی هەڵگرێ، جا لەوێ حۆری و کانیاوو باغ و چۆمی شیری و هی هەنگوینی و هی شەڕابی و....هتد یان دەدەنێ، بەم جۆرە بەهۆی ئایین و خواپەرستی یەوە ڕەش و ڕووتەکان لە خشتە دەبەن و بە سەهوویان دەبەن، بۆ خاتری وەی پارووی چەورو شیرن و جێی گەرم و نەرم و ناز و نیعمەتەکانی دنیا بەتەنێ بۆ وان وەمێنێ و کورد گوتەنی: کلکێی تێدا ڕاوەشێنن(1).

بەڵێ لێرەدا چیدی خۆم پێ مەرزەم نەکراو گوتم:

---

(1) بێگومان لێرەدا نارێکی یەك لە قسەکانی (م) دا دەبینرێ ، چونکە گەل هیچ کاتێك بە هەویا ئەوەی نەبوە ئایین و خواناسی لە بابایەکی ستەمکار و سەرمایەدارەوە فێر بێ، جا مەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە پێشەوایانی ئایین یارمەتی زاڵم و ستەمکاریان داوە، ئەوەش درۆیە بێجگە لە چەند حاڵەتێکی کەم.

+ برا[1] گیان پێشینان گوتوویانە: قسە بێ دەسەڵاتە هەموو کەس پێی دەوێرێ، هەر قسەیەکیش کە دەکرێ ڕاست و درۆیان هەڵ دەگرێ، جیاوازی نێوان ڕاست و درۆیانیش، هەبوونی بەڵگەیە بۆ یەکەمیانی و نەبوونی بۆ دووەمیان، جا ئەگەر گەرەکتە ئەو قسانەی تۆ وەبەر دەستەی دووەم نەکەون و مۆری (درۆ)یەتی یان پێوە نەنرێ پێویستە بەڵگەیان بۆ بێنیەوە، ئایا چ بەڵگان شك دەبەی بۆ وەڕاست گێڕانی قسەکانت؟!

☐ بەڵێ .

+ کوا، بەڵگەکانت چن؟!

☐ بەڵگەم قسەی ڕابەر و پێشەوایانی ئایینە.

+ ناڵێم ڕابەر و پێشەوایانی ئایین هەموویان چاکن و خراپیان تێدا نیە چونکە ئەوانیش وەك خەڵکی ئینسانن و فریشتە نین، کوردیش گوتوویەتی: چەم بێ چەقەڵ نابێ، بەڵام ئایا دەگونجێ قسەی هەڵە و لەگەڵ ئیسلام دا دژی هەندێك شێخ و مەلا و دەروێشی نەزان و نەفام یان دین فرۆش و بێ تام، بکرێتە بەڵگەی خراپی و ناتەواوی ئیسلامەتی ! ئایا ئێوەی شوێن

---

(1) دیارە برایەتیی (أخوة) ی ڕاستەقینە تەنها لەسەر بناغەی ئیمان و مسوڵمانەتی دروست دەبێ، وەك خوای زاناو تونا فەرموویەتی : ﴿ إنما المؤمنونَ إخوة﴾ الحجرات -11- ، بەڵام دروستە وشەی (برا) لەگەڵ بابای بێبڕواش دا بەکار بێت چونکە وەك چۆن برایەتی ئیمانی هەیە، برایەتیی نەتەوەیی و نەژادییش هەیە، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ پێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆی (علیهم الصلاة و السلام) بە برای گەل و نەتەوەکانیان داناوە لە حاڵێك دا کە کافر و بێبڕواش بوو ون، وەك فەرموویەتی

﴿ وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ ﴾ الأعراف -65-

﴿ وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ...... وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا .... ﴾ الأعراف- 73 و 85-

کەوتووی کۆمۆنیزم (شیوعیایەتی) ڕێ بە بابایەکی موسڵمان دەدەن کە هەڵە و ناتەواویەکانی : ترۆتسکی و ستالین و لینین و ماوتسی تۆنغ و گارۆدی و میلۆڤان دۆگیلاس بکاتە بەڵگەی ناتەواوی ی ڕێچکەکەتان ؟!

 نەخێر.

+ بۆچی ؟!

 ....(بێ دەنگی).

+ کاکە بۆچی دانی پێدانایەنی، ئیعتیڕاف کردنت بە هەڵە دەقات چاکترە لەوەی بەردەوام بی لەسەری، دان پێدا نەهێنانیشت هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ ، ئەم هەڵوێستەشتم وەك هەڵوێستی حوشترمەل دێتە پێش چاوان، کە دەڵێن: کاتێك دەبینێ ڕاوچی پارێزی بۆ دەبات سەر و چاوی خۆی لە لمی دا قم دەكات، پێ‌ی وایە ئەگەر ئەم ڕاوچی نەدی ئەویش ئەم نابینێ ، بەڵام دیارە خراپ حاڵی بووە.

کەواتە بەڵگەی یەکەمت هەر بۆ خۆت ناوت لێ نابوو بەڵگە، دەنا (بەڵم)یش تەواو نەبوو، ئەمما وا دیارە جەنابت پێت وایە هەموو هەوران بارانیان پێوەیە، بەڵام وا نیە و هەوری متوربە نەکراوو نەزۆکیش هەن.

کە حاڵ وابێ ئێستاش مۆری ناراستی و هەڵەیی بە قسەکانتەوە هەر بریقەی دێ و بەڵگەی پێشووت بایی ئەوەی نەکرد قولینچکێکی ئەو مۆرەش بڕووشێنێ، کەواتە ئەگەر حەز دەکەی قسەکانت وەڕاست گەڕێن، بگەڕێ بە دوای بەڵگەیەك دا، بەڵام لە دەقەکانی خودی ئیسلام بی هێنەوە با وەك کەڕەتی هەوەڵی تووشی چۆرتمێ نەبی.

 بەهەر حاڵ من ئەو مەسەلەیە بە زادەی ئیسلام دەزانم.

+ کام مەسەلە؟!

 ئەوە کە دەڵێت : واز لە ژیانی دنیا بێنن و خۆتان بۆ ژیانی بەهەشتیّ هەڵگرن، لە زۆر ئایەتی قورئانیش دا دووپات کراوەتەوە.

+ ئەمن ناڵێم زۆر ئایەت ، بەڵکو دەڵێم هەر تاقە ئایەتێکم بۆ بێنەوە تا بۆت بسەلمێنم.

 چ ئایەتم لەبەر نین، چونکە بە زمانی عارەبی بەڵەد نیم بەڵام چەمك و مەبەستی ئەو ئایەتانەم لەبەرە کە لەو مەسەلەیە دەدوێن.

+ جا مادام عارەبی نازانی و لە قورئانیّ حاڵی نابی چۆن بۆت هەیە وا بە ڕاشکاوی بوختانی بۆ هەڵبەستی، ناشڵێم ڕەخنەی لیّ بگری ؟!

 جا بۆ خۆ مەرج نیە هەر کەسێك بیەویّ لە قورئانیّ بگات شارەزای زمانی عارەبی بیّ، ئەمن تەرجەمەی ئەوان ئایەتانم بە فارسی موتالاّ کردوە.

+ ئەها، ئیّ ئیّ ئێستا زانیم مەسەلەکە چۆن چۆنیە، تۆ لەو کتێب و نوسراوانەدا کە بابای مارکسی نووسیونی خوێندووتەوە کە شتی وا لە قورئانیّدا هەیە، بەڵام حەیفیّ ئەم بەڵگەیەشت وەك گۆرینەکەی پێشوو چرووکی کرد و نیشانەی نەپێکا، چونکە قەت قەت قسەی دوژمن لەسەر دوژمنی بە بەڵگە ناشیّ، کوردیش گوتوویەتی: ( ئەگەر کەسێك کەسێکی دزا خەونی خراپی پێوە دەبینیّ ). توخوا براله هەر بیخە بەر ویژدانی خۆت، بە چ ڕیّیەك دروستە کە قسەی موددەعی بکرێتە بەڵگە و شایەدی دەعواکەی؟!

وەڵڵا ڕاست لە حاڵێکی ئاوا دابوە کە کوردان گوتوویانە: ( لە ڕێوی یان پرسی کێت شایەدە؟ گوتی: کلکم !! ) .

برای ئازیز خۆ نەزانین عەیب نیە، دەبوو هەر لەسەرەتاوە پرسی بات: ئەرێ کاکە شتی وا لە ئیسلامەتی دا هەیە یان نا، نەك شەلم کوێرم ناپارێزم تفەنگێ بە تاریکیەوە بنێ‌ی.

ئێستاش نەختێك دان بە خۆت دابگرە و بە چاوی دڵ تێفکرە تاکو بە کورتی چۆنیەتی ئەو مەسەلەیەت بۆ ڕوون بکەمەوە، با چیدی لە گۆماوی خەیاڵاتی خۆت دا پەلەکوتە نەکەی:

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە شانۆی بوونەوەر بە مەبەستی تێدا ژیان و تاقی کرانەوەی ئینسان ساز کراوە، وە ژیانی دنیا قۆناغێکە لە قۆناغەکانی سەفەر و گەشتی ژیانی ئینسان و خوای کاربەجێ و زانا ویستی وابووە کە پێیدا ڕەت بێ، هەڵبەتە مادام خوای مەزن لەسەر مرۆڤیش پێویست کات کە بەم قۆناغە ژیانی دنیا دا گوزەر بکا، گومانی تێدا نیە کە هەموو ئەو پێداویستیانەی ئینسان لەم ژیانەی دا حەوجێ‌یان دەبێ، بۆی دابین کردون.

بۆیە دەبینین پەروەردگار هەر لە دەمی خولقاندنی یەکەمین مرۆڤەوە پەیتا پەیتا بە چەند مرۆڤێکی شایستە و لە باران دا هەبوەوە کە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) بەرنامە و پەیڕەوی ژیانی بۆ بەرەی ئادەمیزاد ڕەوانە کردوە کە بریتی یە لە "ئاییـن"[1] .

(1) (ئایین) بە چەمك و واتا عورفییەکەی ئەگەرنا وشـەی (دین) لە قورئانێ کە (ئایین) تەرجەمە کوردییەکەیەتی بە چەند واتایەك بەکارهاتوە کە یەکیان بەرنامە (منهج)یە جا چ لە خواوە هاتبێ و ڕاسـت بێت وە چ لە غەیری خواوە سـەرچاوەی گرتبێ ئەو مەسەلەیەش بە تێر و تەسەلی لە کتێبی: ( خواناسیی ، ئایین ، ئیمان) دا توێژراوەتەوە، بڕوانە چاپی یەکەمی نووسینگەی تەفسـیر ، لاپەڕە (165) تا (244) ئایین چی یە ؟! کە بەندی یەکەمە لە بەشـی دووەم.

جا هەرچەندە ئەو بەرنامەیە بۆ هەر گەل و تیرەیەك لە قاڵب و شێوازێکی تایبەتی دا نێرراوە واتە بە شێوەیەك کە لەگەڵ ئاستی فیکری و ژیانی ئەو کۆمەڵەدا بگونجێ بەڵام لە کاکڵ و مەبەست دا هەموو شێوە بە دیمەن جوێ جوێیەکانی ئایین یەکن و بە شێوەیەکی گشتی ڕێنموونی ئینسان دەکەن بۆ نواندنی هەڵوێستێکی فیکریی و کرداریی ڕاست لە ئاقار خودا و خەڵك و ژیان دا. جا ئەو هەڵوێستە چ لە بواری کەسیی دا پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤەوە هەبێ چ لە بواری خێزان دا چ لە بواری کۆمەڵگادا وە چ لە بواری دەوڵەت دا[1]

ڕوون و ئاشکراشە کە بەرنامەیەکی ئاوا هەمە لایەنە پێویستە هەموو ئەو یاسا و دەستوورانەی تێدا بن، کە پێویستن بۆ هێنانە دی و بەڕێوەبردنی ژیانێکی ئادەمیانەی ڕێك و پێك، کەواتە پشت گوێ خستن و وازهێنان لە ژیان لەهەر لایەنێکی دا بەهیچ کلۆجێك لەگەڵ ئایین و بەرنامەی خوادا دانووی ناکوڵن، بۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (**ان الرهبانية لم تكتب علينا**) **رواه الامام احمد في مسنده.**

---

(1) کەواتە ئەم شێوە حاڵی بوونەی زۆربەی میللەتی مە لە ڕێبازی ئیسلام، شتێکی دوورە لە واقیع و نێوەڕۆکی ئایین و بەرنامەی خودا، بەڵێ ئەو جوغزە گچکەیەی کە ئێستا چەمکی ئایینی تێ خزێنراوە و تێی دا کورت هەڵاتوە کە بریتیە لە لایەنی ڕەوشت و خوو و بەجێ هێنانی برێك لە درووشمەکان لایەنێکە لە لایەنەکانی ئیسلام نەك سەرتاپای ئیسلام، بەڵام ئەگەر بویسترێ ئیسلام هەمووی بەڕێوە ببرێ دیارە بەڕێوە بردنیشی فەرزە لەسەر هەر موسڵمانێك پێویستە مرۆڤ چ لە بواری شەخسی و چ خێزانی و چ کۆمەڵگایی و چ دەوڵەتی، لە هەموو لایەنەکانی : مەعنەوی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سوپایی و پەروەردە و فێر کردن و هتددا تەنیا پرس بە ڕێباز و بەرنامەی خوا بکا و، حەرامە لە هیچ کاروبارێکی ژیانی دا پابەند و بەندەی غەیری خوا بێ، بەڵێ پێویستە موسڵمان زۆر چاك بزانێ کە فەرمانبەری کردنی بۆ غەیری خودا، لەهەر شتێك دا بە هاوتا پەرستی (شرك) لە قەڵەم دەدرێ، چونکە بەرنامەدانان هەر لە خوا دەوەشێتەوە.

واتە: واز لە دنیا هێنان و گۆشەنشینی لەسەر ئێمە نەنووسراوە و لە ئیسلام دا نیە.

قورئانی بەرێزیش دەفەرموێ :

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ﴾ الأعراف – 32.

واتە: بڵێ کێ ئەو شتە جوان و ڕۆزی یە بەلەزەتانەی قەدەغە کردوون کە خوا لەبەر خاتری بەندەکانی ڕەخساندوونی؟

لەجێیەکی دیکەدا دەفەرموێ:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ ﴾ الجاثية – 13

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە خوا بۆ ئێوەی مەیسەر کردوە.

جا نازانم لە کاتێك دا پەروەردگار بڵێ: ئەی خەڵکینە بوونەوەر و هەرچی تێی دا بۆوەم هێناوەتە دی و بەردەستم کردوە، کۆمەڵێك ژیانی دنیا و نیعمەتەکانی وەلانێن و سەرپێچی لە فەرمانی خوا بکەن، دەبێ بۆچی ئەم ڕەفتارە چەوت و هەلەیەی ئەو کۆمەڵە بکرێتە بەڵگە و شایەدی چەوتی و هەڵەیی ئایین !!

ئەوە سەبارەت بەو قسەیەت کە دەڵێ: ئیسلام خەڵك هەڵدەنێ بۆ واز هێنان لە ژیانی دنیا و خۆ هەڵگرتن بەهەویا بەهەشتێ [1] .

---

(1) لێرەدا ڕاستیەك هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین:

وەك پێشتر گوتمان و سەلماندیشمان ئیسلام فەرمان ناکات بە واز لە دنیا هێنان و گۆشەنشینی، بەلام وێڕای ئەوەش ئیسلام ڕازی نیە بە ڕۆچوون و زیادەڕەوی لە ڕابواردنی ژیانی دنیادا و بەندەکان هەڵدەنێ بۆ بە کەم سەیر کردنی دنیا و بۆیان دوویات دەکاتەوە کە دنیا جێی تاقی کردنەوەیە نەك ڕابواردن، وە ژیانی دوایی ڕابواردن و سانەوەی ڕاستەقینەی تێدایە، دیارە ئەمەش

سەبارەت بەو قسەیەش کە دەڵێ: ئیسلامەتی چەکی دەستی بورژوا و سەرمایەدار و ستەمکارانە بۆ چەوساندنەوە و مژینی خوێنی چینی ڕەش و ڕووت، دەڵێین: لە هیچ کام لە دەقەکانی ئیسلام دا وەبەرچاو نایەت، کە بە بابای ڕووت و چەوساوە و بەشخوراو بڵێ : واز لە ژیانی دنیا بێنە و مل بۆ ڕۆژگـــار کەچ بکە و دەست لە کـاری خــوا مەدە و بە بەش و قسمەتی خـودا ڕازی بە !!

جا چۆن ئیسلام قسەی وا دەکات لەگەڵ ئەوەش دا کە خوای بە بەزەیی و دادگەر هیچ کاتێك قایل نیە هەندێك لە بەندەکانی پڕ و هەندێکیش قڕ بن !!

برالە ئەتۆش و هەر کەسێکی دیکەش کە بە بەرنامە و حوکمی خوا ئاشنا نین زۆر چاك بزانن: کە ئەم بارودۆخە ناقۆڵایەی ئێمە تێ‌ی دا دەژین، کە دەبینین نازو نیعمەتەکانی دنیا لە چەنگ چەند کەسێکی ستەمکار و سەرمایەداردا کۆبۆتەوە و زۆربەی خەڵکیش بە زگێك تێرە و بە دووان برسی[1] ،

بەڵێ زۆر چاك بزانن کە ئەم باروزرووفە دزێوو پڕ ستەمە نە ئیسلام هێناویەتە کایەوە و نە بە مانەوەشی ڕازی یە، ئیسلام نەی هێناوەتە کایە چونکە ئیسلام خۆی شۆڕشێکە دژی چینایەتی و ئاغا و مسکێنی و لەهەر

---

لەگەڵ قسەکانی پێشوودا دژایەتی نیە، چونکە مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ گرنگی دانیشی‌دا بە ژیانی دنیا خۆی تێدا قم نەکات و پارێزی لێ بکات..

(1) دیارە ئەو دیاردەیەی بیســت ساڵ لەمەوبەر باسم کردوە لە کوردســتان و غەیری کوردستانیش دا ئێســتا (2006/3/21) لە سایەی دەســتەڵات و حوکمی ڕژێمە عەلمانییەکان دا و لـە سایەی ســەقامگیربوون و پەرەســتاندنی ســیستەمی ســەرمایەداریی (کاپیتالیزم)دا بە تایبەت پاش ڕووخان و هەرەسی ســیســتەمی ســۆسیالیستی ، یەکجار لەو کاتە زەقتر بۆتەوە و بە جارێك خەڵك و جەماوەری ڕەش و ڕەوتی ســەغڵەت و بێزار کردوەو و کوردســتانەکەی خۆشــمان پشــکی گەورەی لەو دیاردە دزێوەدا هەیە، ســەدجار حەیف و مخابن !!

چاخێکیش دا بە ڕاستی بەڕێوەبرابێ ڕەگ و ڕیشەی ستەم و زۆر و چینایەتی و چەوساندنەوە و بێ دادی لە بن دەرێناوە.

ئایا بێ ویژدانی و بوختان چیەتی نیە کە ڕژێمی ئاغا و مسکێنی و چینایەتی بخرێتە ئەستۆی ئیسلامێك کە دەڵێت **"کلکم من آدم وآدم من تراب"**(1) .

واتە: گشتتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە.

وە دەڵێ : **﴿ كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ ﴾** حشر - 7

واتە : با ماڵ و دارایی بەس لە نێو دەوڵەمەندەکان دا پەزمەندە نەبێ.

وە دەڵێت: **﴿ وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ ، الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ ، يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ، كَلاَّ لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾** همزة 2، 3، 4.

واتە: سزایەکی توند هەیە بۆ هەر کەسێك کە ڕووبەڕوو پاشە ملە غەیبەتی خەڵکی دەکات، ئەوەی هەر خەریکی ماڵ خڕ کردنەوە و ژماردنیەتی، پێی وایە سامانەکەی دەبێتە هۆی هێشتنەوەی لە دنیادا نەء  با واز لەو ڕەفتارە بێنێ  فڕێ دەدرێتە نێو دۆزەخی وردوخاش کەرەوە.

وە ئیسلام بە مانەوەی ئەو باروزرووفەش قایل نیە و دەڵێ پێویستە بگۆڕرێ و ژێراو ژوور بکرێ(2) .

---

(1) ئەم فەرمایشتە لە ئەڵقەی سێیەم دا (تخریج) کراوە.

(2) لێرەدا وای بە چاك دەزانم تەم و مژێك کە بەرچاوی گەلێکانی لێڵ کردوە بە ئەسپایی نووکی خامەی بۆ بەرین و بی ڕەوێنیەوە:

زۆر کەسی سادە بیر کاتێك زاراوەی "تێکۆشان لە ڕێی خوادا" لە بڕواداران دەبیەن بێ سێ و دوو کردن مۆری ئایدیالیستیان پێوە دەنێن و دەڵێن: ئیسلام بە هیچ ڕەنگێك نالوێ بکرێتە بنچینەی شۆڕشێك کە کەڵکەڵەی گۆڕانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لەسەری دایە، چونکە ئامانج و مەبەستی ئیسلامەتی شتێکی مەعنەوی و میسالیانەیە و، لەگەڵ ئامانجەکانی شۆڕشێکی نەتەوایەتی‌دا تێك ناکەنەوە و پێك ناگەنەوە !، بەڵام بێ هیچ شك و

له هیچ دەقێکی ئیسلامیش دا به بابای بەشخوراو و شەکەڕۆ و چەوساوە و ماندوو مجرۆ نەگوتراوە سەبرێ بگرە و قەناعەتت هەبێ خوا هەر هێندەی بە قابیل زانیوی و لەوەی پتری پێ ڕەوا نەدیوی، نا، بەڵکو پێی دەڵێ:

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ بقرة -29

واتە: خوا ئەوەی کە لە زەوی دایە بۆ هەمووتانی خولقاندوە، کەواتە پەروەردگار لە پەردەدا بە هەژار و نەدار و بەشخوراوان دەڵێ: ئەو زەوی و زار و کۆشك و تەلار و باغ و باغــاتەی ئاغا و میــر و بەگ [1] و سەرمایەدارەکان شەپ و گوپی تێدا لێ دەدەن و تێیدا ڕادەبوێرن، لەسەر حیسابی ئێوەی هەژار و نەدار بۆیان پێکەوە نراوە، بەڵام ئەدی خۆ بە پێی فەرمانی خوا، لەسەرتان پێویستە لەسەر مافی ڕەوا و بەشی خوراوو ڕەنجی براوو گەنجی دزراوتان وەدەنگ

---

دوودڵییەك هەر كەسێك ئاوا لە ئیسلامەتی بەوە ڕامێنێ زەینی خلیسكەی پێ بردووە، چونكە وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا كە بەندە بە جێبەجێ كردنی دەستوور و یاساكانی بەوە مەحاڵ و ئەستەمە بە بێ گۆڕین و ژێراو ژوور كردنی كۆمەڵگا بە هەموو لایەنە مەعنەوی و ئابووری و سیاسی و كۆمەڵایەتیەكانیەوە، ئاخر هەتا هەموو لایەنەكانی كۆمەڵگایەك نەگۆڕرێ چۆن دەگونجێ كە یاساكانی ئیسلامی تێدا بچەسپێ؟

ئەو یاسا و دەستوورانەی كە هەموو لایەنەكانی ژیانی كۆمەڵگا وەبەر خۆ دەدەن و هیچی لێ نایەڵنەوە.

تێبینـی : لـە كتێبی "ڕێبازی تێكۆشان" دا لـە بەشی "ئامانجی تێكۆشان"دا تێرتر لـەم باسە دواوین، بەڵام حەیفێ جارێ چاپی بە چاوان نەدیوە.

تێبینـی : دوایی ئەو كتێبەم لـێ ون بوو و نازانم كەوتە لای كێ و چی لێهات لـەو هەموو بارەبار و دەربەدەرییەی كە تووشـمان هـات .

(1) بەڵام ئێسـتا (2006) بەرپرسـە حیزبی و ئیدارییەكانی كوردسـتانمان بە تایبەت هی هەردووك حیزبە خاوەن دوو ئیدارەكە. بە چەندان فەرسـەخ پێش دەرەبەگ و میر و ئاغاكانی ئەوسا كەوتوونەوە لە بواری زەوی وزار و كۆشـك و تەلار و شەپ و گوپ لێدان و ڕابواردن بە پارەی بێئـەژمار !!

بێن و نەیەڵن کەس خۆتان لێ بکاتەوە فیرعەون و بە بەلاش و حەلاش خۆتان لەسەر بکاتە نۆ و نیو.

ڕێبازی ئیسلام گەورەترین ئامانج و مەبەستی دوای - بە خەڵك ناساندنیێ, چەسپاندنی دادگەریی کۆمەڵایەتی (العدالة الاجتماعية)یە[1] وەك خوای بالاّ دەست و زانا فەرموویەتی :

**﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمْ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ..﴾** الحديد 25.

واتە: ئێمە پێغەمبەرانمان ﷺ ڕەوانە کردوە بە بەڵگە و نیشانە گەلی ئاشکراوە و کتێب و ترازووشمان پێدا ناردوون، تاکو خەڵکی دەنێو خۆیان دا دادگەری بەرێوە بەرن.

ئەمە سەبارەت بە دەقەکانی ئایین، خۆ ئەگەر لە دەلاقەی واقیعی مێژووە وە سەرنجی ئەم مەسەلەیە بدەین ئەوە چاکتر لە مەسەلەکە حاڵی دەبین: یەکەمین پێغەمبەری خوا "نوح" ﷺ قورئان ئاوای باس دەکات:

**﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ ، أَنْ لاَ تَعْبُدُوا إِلاَّ اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ، فَقَالَ الْمَلاَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ...﴾** هود 25، 26، 27.

---

(1) لە ئاڵقەی ژمارە (5)ی ئەم زنجیرەیەدا (دادگەری کۆمەڵایەتی) تویژراوەتەوە.

تێبینی : هەتا ئێستاش ئەو ئاڵقەیە هەر دەستنووسە و دەرفەتی چاو پێداگێرانەوە و چاپ کردنیمان بۆ نەڕەخساوە (2006) .

واتە: وە ئێمە نووحمان ناردە كن نەتەوەكەی گوتی من بۆ ئێوە ئاگادار كەرەوەیەكی ئاشكرام، كە جگە لە خوا كەس نەپەرستن، بە ڕاستی من مەترسی سزای ڕۆژێكی بە ئازارتان لێ دەكەم. زلەزلە بێ بڕواكانی گەلەكەی گوتیان: ئەتۆش هەر مرۆڤێكی وەك مەی، ناشبینین بێجگە لە دەسكورت و نەدارەكان كە نەفام و گێژن كەسی دیكەت وەدوا كەوتبێ.

لێرەدا وەك مانگی چواردە دەبینرێ كە یەكەمین هەڵگری مەشخەڵی ڕێی خواناسی و یەكەمین نێرراوی خواوەند بۆ مرۆڤایەتی هەژار و ڕەش و ڕووت و ژێر دەستەكان بوونە پشت و پەنا و سەربازی و سەرمایەدار و زلەزلەكانیش دژایەتی یان كردوە و بڕوایان پێ نەهێناوە و لە ڕێی دابوونە پەرچ. دوایین پێغەمبەریش "محمد" ﷺ بۆ هەموان ڕوونە كە هەژار و نەدار و كۆیلە و ستەم دیدەكانی وەك : بیلال و سوهەیب و عەممار و یاسر و سومەییەی باب و دایكی و سەعدی كوڕی ئەبی وەققاس و زەیدی كوڕی حاریسە و عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود و عەبدوڵڵای كوڕی مەكتووم و ..هتد بوونە لایەنگر و پشت و پەنای و، سەرمایەدار و ئەشڕافە ناشەریفەكانی وەك : وەلیدی كوڕی موغەیرە و ئەبووجەهل و ئەبووسوفیان و ئومەییەی كوڕی خەڵەف و ئەبو لەهەب و عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەییە و عوتبە و شەیبەی كوڕانی ڕەبیعە و نەزری كوڕی حاریس و كەعبی كوڕی ئەشرەف و حویەی كوڕی ئەختەب و ..هتدیش كەوتنە بەربەرەكانی و بەربینگ پێ گرتن و دژایەتی كردنی ی.

هەڵبەتە پێچ و پەناش لەوەدا نیە كە پشتگیری كرانی بەرنامەی خوا لە لایەن هەژار و نەدار و ڕەنج كێشانەوە و دژایەتی لەگەڵ دا كرانی لە

لایەن سەرمایەدار و ستەمکارانەوە بەڵگەیەکی ڕوون و درەوشاوەیە لەسەر ئەوە کە نەدار و زەحمەت کێشەکان، لەسەر کرانەوە و وەدەنگ هاتن و دیکتاتۆرەکانیش پەتی پێ لە سێدارەدران و تیغی دەست پێ بڕرانیان تێدا بەدی کردوە و زانیویانە هەر کاتێك ئیسلام دەستی وێیان ڕابگات دەستی تەماع کارییان دەبڕێ و تەخت و تاجی زۆرداری یان ژێرەوژوور دەکات.

دە ئێستا ئەمن هیچ حوکمێك بەسەر قسەکانت دا نادەم، بەڵام هەر بۆ خۆت ویژدانت بکە دادگەر و بزانە ئەگەر لە قسەکانت ژیوان وەبی و دان بەوەدا بێنی کە ئیسلام بە بەبڕشت ترین تیغی دەستی هەژار و نەداران دادەنرێ دژی ستەم و زۆری زۆردار و پارە پەرست و خوێن مژان، پتر پەیرەوی شێوازی عیلمیانەت نەکردوە و بەڵگەی مەنتیقی و زانیاری نابنە پاڵپشتی قسەکانت؟!

لێرەدا (م) مات بوو ژوورەکەمان دەتگوت زیڕووحی تێدا نیە و کورد گوتەنی: وەك ئاشی ئاو لێ بڕاوی لێ هات، هەستم کرد کە قسەکانم وەك پاچێکی نووك تیژ و بڕندە لە زەمینی بیردۆزەی ئەفسانەیی (م)دا کەندڕێکی بێ ڕەزایان هەڵقەندوە، ئەمما لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو هەر بەرلەوەی دە قسان ڕاچین وەك عادەتی هەمیشەیی ئەو جۆرە کەسانە نیەتی هێناوە کە هیچم لێ نەسەلمێنێ مادام ئەو لێ سەلماندنە ببێتە هۆی واز هێنانی لە بەشێك لە پروپاڵانتەی بیرۆچکەکەی، هەستم کرد دەیەوێ هەر چۆنێکی بێ خوای دەکرد بە چنگەڕنەش دەبوو نەختێك خشپ و خاڵی نێو زەوی بیردۆزەکەی خڕ کاتەوە و ناوی لێ بنێ "بەڵگە" و قوڵتی بێ ڕەزای بیردۆزە پووچەکەی پێ پڕوەکات، ئەمما کوردان گوتوویانە: ( نە

ڕەشکە پینە دەکرێ) و (نە بەری ڕۆژێ بە بێژینگێ دەگیرێ) و (نە ئەوی لە سووریش تێی دۆڕاند لە لابای بۆی تێ هەڵدێتەوە)، بەهەر حاڵ بە دەنگێکی تووڕە و ڕەنگێکی هەڵبزڕکاوو ئاوماڵ ڕەش داگەڕاوەوە گوتی:

 بە ڕاستی عاجباتیم دێ کە لە سەدەی بیستەم دا یەکێکی وەك تۆ دەبینم بە جیددی و گرنگی پێدانەوە، هەوڵی ئەوەیەتی بیری ئەفسانەیی ئایین بخاتە قاڵبێکی ژیرانە و زانستیانەوە و ئەو ڕەفتارەی تۆم وەك ڕەفتاری ئەو کەسە دێتە بەر نیگا کە دەیەوێ بەهۆی گۆچانێکی ڕزیوەوە کەلەشێکی مردووی بێ گیان قیت کاتەوە و دیمەنی مرۆڤێکی زیندوو و بەدەووی پێ ببەخشێ، بەڵام هەیهوو هەیهوو پێشینان گوتەنی: ( لە بڵیندان دەڕوانی و دەنەویان دەکەوی!.) .

+ برا گیان وای بە پەسند دەزانم وتووێژەکەمان بە شێوازێکی ژیرانە و عیلمیانە بەرێوە بچێ و شتاقمان پەنا نەبەینە بەر شێوازێکی عاتیفی و شاعیرانە، چونکە کە پەنامان بردە بەر شیعر گوتن و گوتاری عاتیفی ئەو کەسەمان دەی باتەوە کە پتر قسان دەکا و زمان لووس ترە نەك ئەو کەسە کە ڕێباز و فیکرەکەی تەواوو ڕاستە، ئەوی ڕاستیش بێ ئەمن یەکەبارێ خۆم کە لەگەڵ تۆدا وەبەر قسان نیشتم مەبەستم ئەوە بوو ڕاستی و تەواویی ئیسلامت تێ بگەیەنم، نەك زمان لووسی و شاعیرایەتیم، ئیدی نازانم تۆش نیازت چ بووە !.

 بریا زانیبام مەبەست لە وتووێژی زانستیانە چیە !!

+ مەبەستم ئەوەیە هەر کامێکمان ویستی ڕەخنە لە بیرو باوەڕی ئەوی دیکەدا بگرێ خاڵێك دیاری بکەین و لێ ی بدوێین، نەك من لێکدا لێکدا بڵێم

مارکسیزم ئەفسانەیە و تۆش بە هەمان شێوە سەرلەبەری ئیسلام بدەیە بەر نشتەری تیر و توانج بێ ئەوەی دەری خەی چەوتی و ناڕێکی‌یەکە چیە و لە کوێ دایە.

 قسەکانتم بە دڵە، بەڵام دەزانی بۆچی من هەموو ئیسلامم بە ئەفسانە حسێب کرد ؟!

+ بۆچی ؟!!

چونکە بنج و بناوانی ئیسلام بریتی یە لە خواناسی و بڕوا بە خوا بوون، بڕوا بە خوا بوونیش تاقە بەڵگەیەکی زانیاریی نیە پشتیوانی بێ، بۆ خۆشت دەزانی کە بناغەی دیوار لابرا ئەو دیوارەش کە لەسەری بەندە هەرەس دێنێ.

+ بەر لەوەی وەڵامی ئەو قسەیەت بدەمەوە کە گوایە بڕوا بە خوابوون بەڵگەی زانیاری لەسەر نیە، ڕەزامەندی خۆم دەردەبڕم بەرامبەر بەوەی کە مەسەلەی بڕوا بە خوا بوونت هێنایە پێش، چونکە ئەگەر تا ساڵێکی ڕەبەق سەرگەرمی ئەم جۆرە پرسیار و وەڵامانە بین ناگەینە ئەنجام، چونکە دەتوانی لە کۆتایی دا دوای ئەوەی سەلماندت و دانت پێداهێنا کە ئیسلام بەرنامەیەکی زۆر تەواوو تەکوزە، بڵێی : باوەڕم بە تەواویی ئیسلام هەیە بەس ناڵێم خوا ناردوویەتی بەڵکو دەڵێم: موحەممەد کابرایەکی بلیمەت بووە و ئیسلامی لە شێوەی ئاینێکی خوایی دا خستۆتە بەرچاوی خەڵک.

که حاڵ وایە با بێینە سەر مەبەستی بنچینەیی وتووێژەکەمان، زەحمەت نەبێ پێم بڵێ مەبەستت چیە کە دەڵێی هەبوونی خوا هیچ بەڵگەیەکی زانیاری لەسەر نیە ؟!

_ مەبەستم ئەوەیە کە زانایان و شارەزایانی زانیاریەیە سروشتییەکان دوای گەڕان و سووڕان و وردبوونەوەیەکی درێژخایەن توانیان هەزارەها جۆرە کانزا و ڕووەك و گیاندار لە زەوی دا و هەزارەها ئەستێرە و کەهکەشان لە ئاسمان دا وەبینن بەڵام تا ئێستا یەکێك نەی گوت خوام لە فلاّنە شوێن دا هاتە بەر نیگا، لەگەڵ ئەوەش دا کە ئێوە دەڵێن: خوا لە هەموو جێیەك ئامادەیە.

دوای ئەم قسانەی (م) زەردەخەنەیەکم پەڕیە سەر لێوان لە سادەیی و بێ سەر و پێیی قسەکانی.

+ ئایا دەزانی کە لەم چەند دێڕەی ئێستا بەسەر زارت دا هاتن دووجاران لاملیت لەو زانیاری یە کرد کە پێت وایە پێیەوە پابەندی و بەموو لـێی لانادەی !!

□ (بەسەرسامی یەوە) کوا چۆن ؟!

+ <u>یەکەم:</u> کە پێناسەی خوای بەخشندەت کرد بە گوێرەی بیر کردنەوەو لێکدانەوەی خۆت[1]، بەڵام ئەگەر ڕاستە ئەستۆت بۆ فەرمانی زانیاری

---

(1) ئەم خەسڵەتەی شوێن کەووتوانی مارکسیزم □واتە بێ ئاگایی لە بیروبۆچوونی خەڵکی دیکە و هەر لە هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردن □بۆتە خەسڵەتێکی بنەڕەتیان و وەك پنوێکی سپی بە نێو چاوانی گایەکی ڕەشەوە لێیان بووە بە نیشانە و درووشمێکی تایبەتی و پێیەوە دەناسرێن، هەڵبەتە ئەو خەسڵەتەش لە شوێن کەووتوانی هەر بیروباوەڕێك دا هەبێ، دەلالەت لەسەر تێڕانەدیتوویی کابرا دەکات سەبارەت بە بیروباوەڕەکەی، چونکە کەسێك لە بیروباوەڕەکەی دڵنیا بێ و قەناعەتی تەواوی بە ڕاســتی‌یەتی هەبێ، بێ باکانە دەچێتە نێو دەریای بیرو ڕێبازەکانی دیکە و هەوڵی ناسینیان دەدات، بەڵێ خاوەن بیروباوەڕی ڕاست وەك نەڕەشێر دەچێتە نێو دارستان و جەنگەڵی پڕ جەنجاڵی بیردۆزەکان ، بێ ئەوەی لە هیچ شتێك بسڵەمێتەوە، چونکە وەك نەڕەشێرەکە توانا و هێزی خۆی هی خەڵکیشی ناسیوە و دەزانێ هـەتا کـوێ بڕ دەکا.

کەچە، دەبوایە پرست بەوان کەسان کردبا کە دەڵێن خوا دەناسین، تۆ کە ئینسانێکی خوانەناسی و بۆخۆت دانی پێدادێنی کە بڕوات پێ‌ی نیە بە هیچ ڕەنگێك بۆت نیە هەر لە خۆوە پێناسەیەکی تایبەتی بۆ دابنێ‌ی و شێوە و چۆنیەتی بۆ بڕیار بدەی، کاتێك پرست بە خواناس و بڕوادارانیش کردبایە کە هەبوونی خوا چۆنە و بە چ شێوەیەکە، تێ‌یان دەگەیاندی کە خوای مەزن زاتێکی بێ وێنە و هاوتایە و لە مادده پێك نەهاتوە و ئەو کاتیش بەهەویا وەی نەدەبووی کە لە نێو دیاردەکانی جیهانی بەرهەستی ماددی‌دا بێتە بەرچاوانت، هەر ئەو دەمیش دەتزانی کە مەبەستی بڕواداران لە ئامادە بوونی خوا لە گشت شوێنێك دا ئامادەبوونێکی جەستەیی و هەست پێ کراو نیە و مەبەست شتێکی دیکەیە.

دووەم: کە گوتت لە ڕێ‌ی زانیاری‌یەوە خوا نەدیتراوە و هەر شتێکیش لە ڕێ‌ی زانیاری‌یەوە نەبینرێ مانای وایە نیە، چونکە وەك گوتمان ئەوانەی بڕوایان بە خوا هەیە و دەیناسن ، دەڵێن: خوا بێ وێنە و هاوتایە و زاتێکی تایبەتی‌یە و لە هیچ شتێك دا لە دروست کراوەکانی ناچێ.

ئاشکراشە کە ئەو مەودایەی زانیاری و ئەزموون (تجربة) ی بەسەرڕا دەگات چوارچێوەی تەسکی سروشت و ڕواڵەتە ماددی‌یەکانن، چونکە زانیاری بریتی یە لەو وێنە و تێ‌بینی‌یانەی کە ژیری ی بەهۆی پێنج هەستەکانەوە وەدەستی هێناون دیارە هەستەکانیش تەنیا لە بازنەی مادده و ڕواڵەتەکانی دا دەستیان دەڕوا و لەوێ وەولای کەوێ هاڕێ لە برێ ناکەنەوە.

کەواتە خوای زانا و باڵا دەست ناکەوێتە نێو مەودای کەمبەری زانیاری یەوە، مادام واشبێ زانیاری بە هیچ کلۆجێك بۆی نیە ڕای خۆی دەربارەی ئەو مەسەلەیە دەربڕێ نە بە چاك نە بە خراپ.

که دەشڵێین خوای مەزن بازنەی گچکەی زانیاری نای گرێتە نێو خۆی و نابێ لەوێدا بۆی بگەڕێین[1] ، کەس بۆی نیە خۆی گیف کاتەوە و بڵێ مادام

---

(1) لێرەدا ڕەواندنەوەی تەمی گومانێک پێویستە کە ڕەنگە بەرچاوی گەلێکان لێڵ کات و لە دیتنی ساف و بێ گەرد بێ بەشیان کات:

ئێمە کە دەڵێین پەروەردگار ناکەوێتە نێو مەودای دەسەڵاتی زانیارییەوە مەبەستمان ئەو زانیارییە یە کە لە ڕێی هەستەکانەوە دەسگیر دەبێ (واتە زانیارییە سروشتییەکان) هەڵبەتە نەدیتزانی خواش لە ڕێی زانیارییەوە ، ئەوە ناگەیەنێ کە زانیاری پشتگیری فیکرەی خواناسی ناکات، چونکە بڕواداران برندەترین و کاریگەرترین چەکی دەستیان بۆ ڕامالینی بیرۆچکەی بێ بڕوایی، لە زانیاری دروست دەکەن، بۆ زیاتر ئاوەڵا بوونەوەی مەبەست وێنەیەك دەخەینە بەرچاوان:

ئایا گوێ لە مانا و چەمکی ئەو وشە و پیت و بڕگانە حاڵی دەبێ کە لە کاتی قسە کردن دا دەیان بیستێ؟ بێ گومان نەء، بەڵام ئایا ماقووڵە بڵێین گوێ هیچ ڕۆڵێك ناگێڕێ لە دروست بوونی دیاردەی (لە قسە حاڵی بوون)دا ! دیارە نەء، چونکە هەرچەندە گوێ (واتە کۆئەندامی بیستن) بۆ خۆی توانای لە قسە حاڵی بوونی نیە، بەڵام لەو بارەوە دەورێکی یەکجار مەزن دەبینێ، چونکە هەڵدەستێ بە گەیاندنی شەپۆلە دەنگیەکان (الموجات الصوتية) بە دەزگا جۆراوجۆرەکانی مێشك، ئەویش هەڵدەستێ بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە سەبارەت بەو پیت و بڕگە و وشانەی کە لە نێو هەناوانیان دا مانا و چەمکەکانیان هەڵگرتوون. زانیارییە سروشتییەکانیش کە بە هۆی شەداوی پێنج هەستەکانەوە دەسگیر دەبن هەرچەندە ڕاستەوخۆ نالوێ بکرێنە بەڵگەی هەبوونی پەروەردگار ئەمما دەبنە سازدەری زەمینەیەکی ڕەق و پتەو بۆ ژیری، واتە: زانیاری ڕێك و پێکی وردەکاری لە بوونەوەردا بەدی دەکا و دەی گەیەنێ بە ژیری، ئەویش وەك مێشەنگوینەیەکی چووست و وریا لەو شیلەیەی کە پوورە هەنگی هەستەکان لە شا گوڵەکانی باغی ڕازاوەی بوونەوەردا چینویانە و مژیویانە و پەزمەندەیان کردوە، هەنگوینێکی بەلەزەتی لێ دروست دەکات، هەنگوینێك کە شیفای سەدان دەردی کوشندەی پێ دێ و مرۆڤ لە نەساغیی بێ بڕوایی قوتار دەکا و گەورەترین ڕاستی پێ ئاشنا دەکات.

وابێ نیە، چونکە ئینکاری کردن لە هەبوونی خوای بەخشندە لەبەر بەرهەست نەبوونی وەك ئینکاری کردنە لە هەبوونی هێزی موگناتیسی و تەزووی کارەبایی و هێزی ڕاکێشان و سۆز و عاتیفە و شەپۆلە تیشکیەکانی ژوور وەنەوشەیی و ژێر سوور لەبەر بەرهەست (محسوس) نەبوونیان[1] .

ئایا ڕاستە هەر شتێك نەکەوێتە بەر قەڵەمڕەوی هەستەکان نیە؟

بێ گومان نەء، چونکە وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە، زانیاری نەبوون سەبارەت بە شتێك بەڵگە نیە لەسەر نەبوونی ئەو شتە، یان بە تەعبیری پسپۆڕانی ژیربێژی: ( عدم العلم لا یستلزم علم العدم ) .

ئێستا بۆ زیاتر ئاوەڵا بوونی مەبەست وێنەیەك دێنینەوە:

کابرایەکی ماسی گر کاتێك تۆڕێکی گچکە داوێتە نێو ئاوێ و نەهەنگ و ماسی یە هوولەکانی پێوە نابن، بۆی نیە لاموجیمی لە هەبوونی ئەو نەهەنگ و ماسی یە زلانەدا بکات هەر لەبەرئەوەی بە تۆڕەکەیەوە نەبوون.

پێنج هەستەکانیش کە ڕێگەی دروست بوونی زانیارین لە ڕێی کۆکردنەوەی وێنە و دەنگ و تاقی کردنەوەو تێبینی یەکانەوە، وەك تۆڕە

---

(1) لە ڕاستی دا بڕوا بە خوا بوون فراوانی و کراوەیی‌یەکی تەواوی ئاسۆی بیروهۆشی گەرەکە و کەسێك نەتوانێ عادەتی تاقی منداڵی و ساوایی تەرك کات کە بۆ هەر شتێك ئامادەبوونێکی جەستەیی دەوێت، ناتوانێ بڕوا بە خوا بێنێ، بڕوا بە خوا بوون لە بیرو هۆشێك دا کە بە دیواری ماددە دەورە دراوە و جگە لە دەوروبەری نیزیکی خۆی هیچی دی نابینێ، جێی نابێتەوە و ناحەجمێ ، بەڵکو پێویستە ئینسان ئاسۆی بیرو زەینی بەرین و بە بەرەوە بوو بێ و تەنیا لەسەر جیهانی بەرهەست چاوی چڕ دانەگرێ. وە بڕوا بە خوا هێنان ڕاستە و ڕاست وەك دان هێنانە بە بوونی هێزی کێشندە و هێزی موگناتیسی و تیشکی سینی و ئەلکترۆن و پرۆتۆن دا، بڕوا نەکردنیش بە هەبوونی خوا کت و مت وەك بڕوا نەکردنە بە هەبوونی ئەم دیاردانە.

گچکەکەی کابرای ڕاوچی تەنیا بەشێك لەو شتانەیان دێتە ژێر ڕکێفەوە کە لە بوونەوەردا هەن، کە بریتین لەو شتانەی دەکەونە نێو جوغزی دیوە هەست پێ کراوەکەی بوونەوەرە، هەر کەسێکیش ئینکاری بکات لە دان هێنان بە هەبوونی ئەو شتانەدا کە بە قولاپی هەستەکان نەگیراون ڕاست وەك کابرای ڕاوچی لێ دەقەومێ.

ئێستا لە نێو هەزارەها دیاردەی هەست پێ نەکراوی بوونەوەردا تەنیا یەکێکیان بە نموونە دێنینە بەر چاوان:

(شادی) دیاردەیەکی دەروونی ئینسانە و هیچ کەس نکوولّی لە هەبوونی ناکات لەگەڵ ئەوەش دا بەرهەست نیە، باشە بە کام لە پێنج هەستەکان هەستی پێ دەکرێ ؟!

ئایا ڕەنگی هەیە تا بە شەداوی چاو بگیرێ؟

ئایا دەنگی هەیە تا بە قولاپی گوێ مەیسەر کرێ؟

یان تامی هەیە تا بەزار و زمانان بچێژرێ؟

یان بۆنی هەیە تا بە ئەندامی لووت بۆن کرێ؟

یان قەبارەی هەیە تا دەستی لێ بکوترێ؟

کەواتە چۆنمان زانی کە هەیە و لە چ ڕێیەکەوە پەی مان پێ برد ؟!

لە وەلّام دا دەلّێین: هەروەك چۆن ئەگەر لە حالّەتی دەستەوسان مانی تۆڕە گچکەکەدا لە ئاقار گرتنی نەهەنگ و ماسیيە زلەکان دا ماسی گرەکە هانای بردبایە بەر ئامرازێکی تەواوتری وەك: تۆڕێکی گەورە، یان نارنجۆکێـك، یان گازێکی کوشندە، زۆر بە سێنایی دەی توانی ئەو نەهەنگ و ماسی یە زلانە مەیسەر کات، هەر بەو پێ و دانەش لە کاتێك دا هەستەکان لەپەی بردن بە هەبوونی دیاردە مەعنەوی و غەیبی یەکان دا بە

دەستی بەتاڵ و حەتاڵ دەگەڕێنەوە  چونکە وەك تۆڕە چووکەڵەکە تەنیا لە مەودایەکی کەم بەردا دەستیان دەڕوات ئەگەر هانا وەبەر ژیریی بەرین، بێ ئەوەی ئارەقێ بکا و خۆی شلوێ کا مەخسوودمان حاسڵ دەکا[1]. بۆ

---

(1) لێرەدا قوڵە نەزیلەیەکم هاتەوە یاد گێڕانەوەی بێ سوود نیە:

دەگێڕنەوە (لینین) نوێنەرێکی خۆی ڕەوانەی ناوچەی سەمەرقەند دەکات، کە دانیشتووانی موسڵمانن، بۆ خاتری وەی وتووێژیان لەگەڵ بکا و ئایینیان لەبەرچاو بخات و لە بەر دڵیان بی بێزێنێ و بۆیان ڕوون کاتەوە کە خوا نیە و ئایین تریاکی گەلە وەك مارکسی مامۆستای فێری کردوە !

بەڵێ نوێنەرەکە دەگاتە جێ و کاتێك مەبەستی هاتنەکەشی بە دانیشتووانی سەمەرقەند ڕادەگەیەنێ، پێی دەڵێن : ئێمە کە دوای ئەم ڕێبازی خوایە کەوتووین بێ هۆ نیە و دیارە ڕاستی ئەم بەرنامەیەمان بۆ دەرکەوتوە، تۆش کە نیازی ڕاگەیاندنی شتێکی وات هەیە، دەتوانی لەگەڵ یەکێك لە زانایانمان دا بدوێی.

دوای دیاری کردنی کات و جێیەکی تایبەتی و خڕ بوونەوەی ئاپۆرە و حەشاماتێکی زۆر، بەم جۆرەی خوارێ پێکەوە دەدوێن.

زانای ئایین: بڵێ بزانم بەڵگەت چیە بۆ سەلماندنی نەبوونی خوا؟!

نوێنەرەکە : هەر شتێك هەبێ بە یەکێك لە پێنج هەستەکان بوونی دەزانرێ، بەڵام ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن "خوا" تا ئێستا بە هیچ کام لەو هەستانە بوونی نەزانراوە، کەواتە: نیە.

زانا: دەها بزانم چۆن دەتوانی بەهۆی پێنج هەستەکانەوە  کە دەڵێی توانای ناسینی هەموو شتێکیان هەیە  بزانی ئەو دوو تۆپە کێهەیان گرانترە؟! (یەکێك لە تۆپەکان ئاسنە و ئەوی دیکەشیان تەختەیە بەڵام لە ڕەنگ و قەبارەدا وەك یەکن).

نوێنەر: (دەست دەکا بە بەکارهێنانی هەموو هەستەکانی بەڵام هیچی بۆ هەڵ ناکرێنرێ و دۆش دادەمێنێ).

زانا: ها ئێستا دەڵێی چی؟!

نوێنەر: هەر لەسەر ڕای هەوەڵێم: (ئەمە دەڵێ و وەك کەسێك کە پووره هەنگێ لەداری دا دەبینێتەوە خۆشێك دەست دەداتە تۆپەکان و دوای هەڵسەنگاندنیان ئاماژەی تۆپە ئاسنینەکە دەکات و دەڵێ ئەمەیان گرانترە).

زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەستم وای بە چاك دەزانم قسەیەكی زۆر گرنگی فەخرەددینی ڕازی باس بكەم :

بوون (الوجود) سەبارەت بە چۆنیەتی ناسین و پەی پێ بردنی دەكرێ بە دوو بەشەوە :

یەكەمیان مرۆڤ ڕاستەوخۆ دەتوانێ پەی پێ بەرێ، وەك بەشێكی زۆری ڕواڵەتە سروشتیەكان.

دووەمیان ڕاستەوخۆ پەی پێ نابرێ و ناچارین لە ڕێی شوێنەوارەكانیەوە بی ناسن[1] ، بۆ نموونە : شادی، پەژارە، دیارە هەر كام لەم دوو دیاردە

---

زانا: زۆر ڕوونە كە هەڵسەنگاندن بە هیچ كام لە هەستەكان ئەنجام نادرێ: پێم بڵێ چ شتێك پاڵی پێوەنای كە تۆپەكان هەڵسەنگێنی؟!

نوێنەر: چۆن، ژیریی پاڵی پێوە نام.

زانا: كەواتە بە هۆی ژیرییەوە توانیت پەی بە گرانی و سووكی تۆپەكان بەری نەك بەهۆی هەستەكانەوە.

مادام واشبێ خۆشت و ئەو كەسەشت وەدرۆ خستەوە كە دەڵێ:

هەرچی هەبێ هەستەكان پەی بە هەبوونی دەبەن.

بەم تــەرزە نوێنەری (لینین) ئەستۆی دۆڕاندن و بەزین شــۆڕ دەكا و لە ڕێیە هەوەڵی ڕا دەگەڕێتــەوە و ئەم سەركەوتنە فەلسەفی و عیلمی‌یە بایەخ دارە بۆ ڕیش ســپی‌یەكەی بە دیاری دەباتەوە.

لەوانەیە یەكێك پرسیار بكات:

باشە ئەو نوێنەرە چۆن دوای ئەو دۆڕاندن و تێ شكانە فیكری یە پاشگەز نەبۆتەوە و بڕوای بە گەورەترین ڕاستی نەهێناوە؟

لە وەڵام دا دەڵێین: جا چۆن شتی وا دەبێ خۆ ئیجازەی شێخەكەی پێ نەبوو، ئەم بەسەرهاتەم لە كتێبی (التكامل في الاسلام)ی احمد امين وەرگرتوە.

(1) ئەوەی نێوان دووكەوانەكان دەقی قسەی ڕازی یە لە تەفسیری (مفاتيح الغيب)دا .

نەفسیانە شتێکی مەعنەوی و هەست پێ نەکراوە و راستەوخۆ زەفەر بە ناسینی نابەین، بۆیە بە ناچاری ئاوڕ وەلای ئەو شوێنەوارە دەدەین کە هەر یەکێکیان لەسەر ڕووپەڕی جەستەی ئینسان تۆماریان دەکات، بەم پێیە لە ئاکامی دیتنی گەشیی دەم و چاوو خەندەی سەر لێوان دا دەتوانین هەست بەوە بکەین کە فلان کەس بە کەیف و شادە، وە لە ئاکامی دیتنی ترش و تاڵی و نێو چاوان گرژیدا پەی بەوە دەبەین کە فیسارەکەس پەژارەدار و غەمگینە.

هەروەها کاتێك شوێنەواری (قەڵای دمدم) دەبینین دەتوانین پەی بە هەبوونی میرێکی کوردی وەك (میرخانی لەپ زێڕین) بەرین، واتە هەرچەندە میری لەپ زێڕین ئێسك و پڕوسکیشی نەماون، بەڵام بەهۆی ئەو شوێنەوارەیەوە کە لە پاش خۆی بەجێی هێشتوە دەتوانین ئەوە بزانین کە ئەو میرە کوردە لەسەردەمێك دا هەبووە.

هەر بەو پێ و دانەش پەروەردگاری باڵا دەست هەرچەندە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە هەستی پێ ناکرێ، بەڵام دەتوانین هەروەك چۆن لە دیمەنی دوو دەم و چاوی گەشاوە و دەم بە خەندە و ترش و تاڵ و نێو چاوان گرژدا توانیمان پەی بە دوو دیاردەی غەیبی و نەبینراوی وەك شادی و غەمگینی بەرین، لە نێو جیهانی ڕێك و پێك و ڕازاوە و پڕ وردەکاری یش دا پەی بە هەبوونی خوایەکی مەزن و باڵا دەست و بە بەزەیی و کاربەجێ بەرین، دیسان هەروەك چۆن ئەگەر لە دەمی دیترانی دوو دیمەنی ڕوو گەشیی و نێو چاوان گرژیی دا پەنا نەبەینە بەر بڕوا هێنان بەهەبوونی دوو دیاردەی مەعنەوی هەست پێ نەکراو، لە ئاقار لێکدانەوەی چۆنیەتی پەیدا بوونی دوو دیمەنی لێك جودا ( ڕوو گەشی و ڕوو گرژیی ) لە دوو شوێنی

یەکسان و وەك یەك دا مەحتەل و دەستەوسان دەبین، بەهەمان شێوە لە دەمی دیتنی جیهانێکی پڕ دیمەنی لێواولێو لە وردەکاریی دا بە بێ پەنا بردنە بەر خوایەکی نادیار و هەست پێ نەکراوو بە گەزی ماددە نەپێوراو، لە ئاقار لێکدانەوەی چۆنیەتی هاتنە دی ئەم جیهانەدا سەغڵەت دەبین و دۆش دادەمێنین، قسەم لەوەی نیە کە لەرچەی ژیری تەلاسا دەبێ و لە قسەی زانیاری تەوەللا دەبێ.

هەتا ئەم قسانەم کردن (م) بە جارێکی ئارامی ی لێ بڕا بوو دەتگوت لەسەر ئاوو ئاورانە، بۆیە هەر لەگەڵ قسەکانم تەواو بوون، زۆر بە تاڵووکە بەربۆ قسە هەڵڕشتن و ڕستە داڕشتن، یان ڕاست تر بڵێم: دەستی کرد بە دەرهاویتن و ڕیز کردنی ڕستە پاکەتی و سپات بووەوەو زۆر جار دووپات کراوەکان، چونکە ئەو وەك عادەتی هاوڕێیەکانی کاتێك لەگەڵ کەسێکی دیکەدا دەکەونە قسە کردن، بیر لە ڕاستیی و هەڵەیی قسەکانیان ناکەنەوە، واتە لە بیری ئەوەدا نین چ ڕاست و بەجێیە قبووڵی بکەن و چیش هەڵەیە و بێ جێیە بەسەر خاوەنی دا بدەنەوە، بەڵکو ئەوان هەر لە بەرایی دا لە بیری ئەوەدانە چ قسەیەك سازکەن هەر چۆنێك بێ بەرپەرچی قسەکانی پێ بدەنەوە. بەهەرحاڵ، ڕستە پەستە بێ بڕستە، پێك هاتوو لە وشە وەك پووشە بەخشە خشەکانی (م) زۆریان خایاند، چونکە ئەو بەستەزمانە هەر لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کێ پتر قسان بکا و زیاتر زاراوەی قەبە قەبە و وشەی هۆقە هۆقەی بەسەر زاری دابێن ئەو دەیباتەوە !!

سەرتان نەیەشێنم ئەوێ ڕۆژێ خۆر گەییە سەرسوێی و ئاواش بوو زەردەش پەڕیە سەران ئەو هەر دەیگوت، ئینجا تاریکی شەوگار بوو بە

پەردەیەك و لێکی جویێ کردینەوە، گفتمان وابوو وەسبەینێ ڕا دەمی ئێواریێ پێك بگەینەوە.

وە سبەینێ ڕا دیسان تا ڕۆژ گەییە سەرسویێ سەرگەرمی قسە و باسان بووین، ئەما چ فایدێی نەبوو، بەڵام بەرلەوەی بۆ دوایین جار لێك بترازێین پێم گوت:

+ باشە برالە وا دیارە جەنابت بەڵگەی زۆر پتەوو زانستیانەت بە دەستەوەیە لەسەر نەبوونی خوای بەخشندە، بۆیە بەو هەموو بەڵگانەی بۆم هێنایەوە ئیقناع نەبووی و دڵت ئاوی نەخواردەوە[1] ، دەبڵێ بزانم تۆ کە هێندە سووری لەسەر بیری بێ بڕوایی گەورەترین بەڵگەت چیە؟!

□ پتەوترین بەڵگەم ئەوەیە کە تا ئێستا بە هیچ کام لە پێنج هەستەکانم هەستم بە بوونی خوا نەکردوە.

+ بەڵام ئێمە پێشتر کۆتاییمان بەم مەسەلەیە هێنا و ، خستمانە ڕوو کە نەبینران و بەرهەست نەبوونی خوا لە ڕوانگەی زانیاری و ژیرییەوە بە بەڵگە دانانرێ لەسەر نەبوونی خوا، چونکە زۆر شتی دیکەش هەیە و زانیاری دان بە هەبوونی دا دێنێ لەگەڵ ئەوەش دا ناکەوێتە بەر قەڵەمڕەوی هەستەکانەوە.

□ بەهەر حاڵ شتێك کە نەتوانم بە پێنج هەستەکانم هەستی پێ بکەم بڕوای پێ نایەنم.

---

(1) لەم وتوویژەدا □ کاتی خۆی □ زۆر بەڵگە باسکران بەڵام دەرفەتم نەبوو هەموان تۆمار بکەم لە دەمی نووسینەوەی دا.

+ یانی بڕواشت بە هێزی ڕاکێشان و هێزی موگناتیسی و تیشکی ژێر سوور و ژوور وەنەوشەیی و خۆشەویستی و شادی و پەژارە و..هتدیش نیە؟!

 بـــا .

+ بەڵام خۆ بە هیچ کام لە پێنج هەستەکانیشت هەستت پێ نەکردون !

_ نەخێر.

+ دەی بۆچی بڕوا بەوان دێنی و بڕوا بە خوا نایەنی ؟!

 ئاخر ئەوان شوێنەواریان هەیە و لە ڕێی شوێنەوارەکانیانەوە دەناسرێن.

+ مەگەر خواوەندی باڵا دەست و زانا شوێنەواری نیە ؟!!

 نەء .

+ ئەدی ئەم بوونەوەرە ڕەنگین و پڕ وردەکارییە شوێنەواری کێیە؟!

 شوێنەواری هەرچی بێ، ئەوەندەی دەزانم ئی خوایەك نیە.

+ بەڵام مەسەلەکە هەر بەوەندە چار ناکرێ، کە ئینکاری هەبوونی خوا بکەین، بەڵکو پێویستە هۆیەك هەر بڕیار بدەین کە بشێ دروست کرانی بوونەوەری پاڵدەینەلا.

_ (بێ دەنگی و کش و ماتی).

+ دەی کاکە چت گوت، لەباتی خوا چیت بڕیار داوە کە بتوانی ڕەخساندنی بوونەوەری پاڵدەیە لا؟! .

_ ئەمن دەڵێم ئەم بونەوەرە بە ڕێکەوت خولقاندوە.

+ ئەدی ناشلێی سروشت خولقاندوویەتی !

_ هەر کامێکیان بێ گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە خوا نەی خولقاندبێ.

+ بە ڕاستی سەیرە براله وا دیارە ئێوە دوژمنایەتیتان لەگەڵ خوادا هەیە، بۆیە لاتان گرنگ نیە داخوا ڕێکەوت یان شتێکی دیکە بوونەوەری خولقاندوە،

گرنگ ئەوەیە شتەکە پاڵ نەدرێتە لای خواوەندی مەزن، بەڵام بەهەر حاڵ، دەبێ رێگەم بدەی سەبارەت بەو رێکەوت و سروشتە پرسیارت لێ بکەم.

□ فەرموو.

+ زەحمەت نەبێ ئەو رێکەوت و سروشتە □ کە پێت وایە هۆی پەیدا بوونی بوونەوەرن □چین ؟!

□ نازانم مەبەستت چیە ؟

+ مەبەستم ئەوەیە کە تۆ بۆیە لەبەر بڕوا بە خوا بوون ڕات کرد، چونکە خوا بەرهەست نەبوو و نەتدەتوانی بە هەستەکانت پەی پێ بەری، بەڵام ئایا ئەو رێکەوت و سروشتەی کە لەباتی خوا دایان دەنێی هەستت پێکردوون و دەیان ناسی، ئەگەر هەستت پێ کردوون تکایە هەواڵم پێ بدە ڕەنگ و دەنگ و بۆن و تام و قەبارەیان چۆنە ؟!

□ نەخێر هەستم پێ نەکردوون.

+ ئەدی لەسەر چ بنچینەیەك بڕوات پێ هێناون، مەگەر تۆ ناڵێی تاقە ڕێی پەی بەشــت بردن هەست کردنە □واتە: دیتــن و بیستــن و بۆن کــردن و تام کردن و دەست لێ کوتان □، خۆ ئیشەڵڵا لە بڕیاری پێشووت پاشگەز نەبوویەوە !

□ جا مادام وای لێ هات منیش بۆم هەیە هەمان پرسیار سەبارەت بە خوا ئاراستەی تۆ بکەم.

+ بەڵێ بۆت هەیە فەرموو:

□ ئایا ئەو خوایـــەی بە بەدیهێنـــەر و خاوەنی جیهـانی دەزانی هەســـتت پێ کردوە ؟!

+ نەء سبحان الله.

 ئەدی چۆن و بۆچی بڕوات پێ‌ی هەیە؟

+ براله ئەتۆ لە ڕاست پرسیارەکەی من دا زارت بوو بە تەڵەی تەقیوو وات زانی ئەگەر بێت و هەمان پرسیاریش لەمن بکەی منیش بەمەرەدی تۆ دەچم، ئەمما بە دەردی کوردە گوتی: قیاسی (کەشك)ێت لەسەر (مەشك)ێ کردوە و خراپ حاڵی بووی، ئەمن وەڵامم هەیە.

 وەڵامت چیە ؟!

+ وەڵامم ئەوەیە کە من لە ڕوانگەی ئیسلامەوە لە دنیایە ڕادەمێنم و لەوانە نیم کە پێیان وایە تاقە ڕێ‌ی پەی بەشت بردن هەست کردنە، بەڵکو دەڵێم لە ڕێ‌ی هەست کردنەوە پەی بە شتە ماددی‌یەکان و دیاردە بەرهەستەکان دەبەین، بەڵام شتە مەعنەوی و دیاردە هەست پێ نەکراوەکان بە تۆڕ و قولاپی هەستەکان ناگیرێن و ناچارین بۆ وان هانا وەبەر ژیریی بەرین.

جا من لەسەر بنچینەی ژیری بڕوام بە خوا هەیە.

 باشە ئەو خوایە چۆنە و چۆن نیە ؟!

+ خوا زاتێکی پاك و بێ گەردە و لە هەموو لەکە و ناتەواوی‌یەك بەری‌یە و خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاکە.

 ئەمەت چۆن زانی سەبارەت بە خوا ؟!

+ ئەمەم لە ڕێ‌ی قسەی خوا و قسەی پێغەمبەرانی خواوە زانی.

 چۆن ؟!

+ چونکە خوا لە کتێبەکانی دا و لەسەر زمانی پێغەمبەرانی ( علیهم السلام) باسی خۆی بۆمە کردوە و خۆی پێ ناساندوین.

 جا چۆنت زانی کە ئەو کتێبانە ئی خوان و ئەو پێغەمبەرانەش خوا ڕەوانەی کردون؟

+ لەوەوە دەزانم کە ئەو پێغەمبەرانە ( علیهم السلام) خوا ناردوونی چونکە هەر کامێکیـــان کـــش گێڕ (معجـــزة)ێکی دراوەتێ، داوای بەرامبەر کێ (تحدی)ی پێ کردوە لەهەر کەسێك کە بڕوای پێ نایەنێ، بەلآم کەس نەی توانیوە وەلآمیان داتەوە و دەگژیان ڕاچێ، بۆ وێنە: گۆچانی حەزرەتی مووسا و مردوو زیندوو کردنەوەی عیسا و قورئانی موحەممەد. (علیهم الصلاة و السلام)

ئینجا لەبەر ئەوەی پێغەمبەرە پێشووەکان هەر کامێکیان بۆ چاخ و سەردەمێکی تایبەتی و قۆناغێکی دیاری کراوو بۆ تیرە و هۆز و نەتەوەیەکی تایبەتی نێرراون کش گێڕەکانیشیان تایبەت بوون بە چاخ و سەردەمی خۆیانەوە و بە لە دنیا دەرچوونیان کۆتایی یان پێ هاتوە، بەلآم پێغەمبەری مە کە قورئان کش گێڕەکەیەتی، هەر ماوە و هەر دەشمێنێ، چونکە دوایین پێغەمبەرە و بۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتی نێرراوە هەتا دنیا دنیایە، کەواتە ئێمە (معجزة)ی پێغەمبەرانی پێشوو ناکەینە بەڵگە، بەلآم قورئانی قسەلەجێ دەکەینە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی (محمد) و پێغەمبەرانی دیکەش، (علیهم الصلاة و السلام) ئێستاش کێ دەڵێ (محمد) پێغەمبەر نیە و قورئانی لە خواوە بۆ نەهاتوە، خۆ مەیدان مشکان نەکێلآوە و ئەوە عەرز و ئەوە گەز ، ئەگەر ڕاست دەکا با وەلآمی بانگەوازی قورئان بداتەوە و تاقە سوورەتێکی وەك قورئان دروست کات، دەنا چاری هەر ئەوەیە مات بێ.

لێرەدا هەڵوەستەیەکم کرد تا بزانم برادەرەکەم چ دەڵێ، بەلآم وا دیار بوو هەستی بەوە دەکرد هەتا وتووێژەکە زیاتر درێژە بکێشێ پتر قرپۆکی

بیرۆچکەکەی و تەواویەتی ئیسلام و خواناسی ئاشکرا دەبێ، بۆیە کرکاتی لە خۆی بڕی بوو خوا خوای بوو ڕزگاری بێ، بەڵام پێم گوت:

+ ها برادەر بۆ هیچ ناڵێی ؟!

 چ بڵێم ؟!

+ چۆن چ بڵێم؟ من داوام لە تۆ کرد کە بۆم باسی ڕێکەوت و سروشتان بکەی بەڵام نەت توانی و پرسیاریشم لێ کردی ئایا هەستت پێ کردون بەو پێنج هەستانەی کە دەڵێی هەر شتێك لە ڕێی وانەوە پەی پێ نەبەم بڕوای پێ ناکەم و نیە ؟!

 (بێ دەنگی).

+ دەزانی چۆن لەم گێژاوە قوتار دەبی !

_ چۆن ؟!

+ تەنیا تاقە ڕێ یەك هەیە کە بتوانی خۆی پێ ڕزگارکەی، ئەویش ئەوەیە کە بڵێی ڕێکەوت و سروشت دوو دیاردەی مەعنەوی و غەیبین و لە ڕێی هەستەکانەوە ناناسرێن. بەڵام ئەوەندەش بزانە ئەو کاتە دووچاری گێژاوێکی عاسێ تر دەبی.

_ چۆن ؟

+ ئەو کاتە ئێمەی بڕوادار دەپرسین باشە ئەوە ئێمە دەڵێین خوا: لە ڕێی پێغەمبەران و کتێبەکانی یەوە خۆی بە ئێمە ناساندوە، بەڵام ئەو ڕێکەوت و سروشتەی ئێوە لە چ ڕێ یەکەوە خۆیان پێ ناساندون؟ ئایا چ کتێبیان و چ پێغەمبەریان ڕەوانە کردوون ؟!

_ (ماتی و سەرسامی).

+ برا گیان گوێ بگرە ! بە زات و سیفەتی خوا هەتا زیاتر وتووێژەکەمان خۆی لێك بكێشێتەوە دەم بۆ دەمێ تووشی سەرسامی و گێژاوی بێ ڕەزاتر دەبی و تەنیا بە یەك شت ڕزگارت دەبێ.

_ بەچی؟!

+ کە بڕوا بە پەروەردگار بێنی و سەری بەندایەتی بۆ دانەوێنی.

_ کاکە خۆ بە تۆبزی نامکەیە موسڵمان ، بڕوا بە خوا نایەنم !!

بەڕێزان لێرەدا لەگەڵ (م) بۆ دوایین جار لێك جوێ بووینەوە، چونکە زانیم کە وتووێژ کردنم لەگەڵ بابایەك دا کە بە قفڵ و کلیلێکی پۆڵایی و مەحکەم دەرگای لەسەر مێشکی هەڵاخنەراوی بە ئەفسانەکانی بیردۆزی مارکسیزم داخستوە و دەقە ڕەق و تەقە وشك و قاڵب بەستووەکانی لـێبوونە لغاوو مەودای نادەن هیچ بلێ، بێجگە لە کات بەفیـڕۆ چوونی بێ هوودە هیچی دیکەی لێ هەڵناوەرێ، بە هەڵوێستی ئەو برادەرە مارکسیستەش قوڵە نەزیلەکم هاتەوە یاد بۆتان نەگێڕمەوە دڵم لەبەرتان نابێتەوە و ناتوانم هەتا لە وتووێژی دووەم دا پێتان دەگەمەوە لێتان جوێ وەبم:

دەگێڕنەوە قاچاغ چیەك بارێکی باڕووت پێ دەبێ و پۆلیس و مۆلیس ڕێی پێ دەگرن و دەڵێن: ها کوڕە بارەکەت چی تێدایە؟ ئەویش دەڵێ قوربان هەمووی تۆ چایە.

بەڵام کاتێك بارەکەی دەپشکنن ، دەبینن هەمووی باڕووتە و باڕووتیش قاچاغە، پێی دەڵێن: چای چی! ساختەچی هەمووی باڕووتە !

دەڵێ: نەخێر هەمووی تۆوچایە و بۆ دەرمانیش باڕووتی تێدا نیە.

پیی دەڵێن: کوڕە باوکم چای چی ، چا ڕەشە و بارەکەی تۆ ڕەنگی خۆڵەمێشییە !! نەخێر نای سەلمێنێ و دەڵێ: ئێوە بە هەڵەداچوون.

یەکێکیان دەڵێ: بۆ ئەوەی چاکتر حاڵی بێ، وەرن نەختێك باڕووتی لەبەر چاوان بسووتێنن.

نەختێك لە باڕووتەکەی لەبەر چاوان دەسووتێنن و دەڵێن: چاوت لێیە چۆن گڕ دەگرێ !

ئەویش هیچ وەسەرخۆی نایەنێ و دەڵێ: بەڵێ بەڵێ چاوتان لـێیە، ئێوە هەر نایسەلمێنن، ئەمن هەر لەسەرەتاوە پێم گوتن چایە، خۆ ئەمجار هیچ قسەتان نەما !! [1]

---

(1) خوێنەری بەڕێز و ئازیزم !

لەبەر ئەوەی بێجگە لە ڕێکەوت و سروشت بێ باوەڕەکان بتێکی دیکەشیان هەیە کە لە بری خوا دەیپەرستن ، هەرچەندە لە دەقی وتووێژەکەدا باسی نەکراوە بەڵام وام بە باش زانی لەم پەراوێزەدا نشتەری ژیری و ژیربێژی (منطق)ی لێ وەکارخەین و پۆرگی هەڵدمساوی پڕ لە بیری ئەفسانەیی پێ بترۆقێنین و بەمەرەدی دوو هاوەڵەکەی بەرین:

**"بەرکوڵێك دەربارەی هەربووێتـیی مادده"**

بەڵگەی ژیریی و زانیاریی لەسەر پووچ کردنەوەی فیکرەی هەربووێتی (ازلیة) مادده هەن و زۆریش هەن، ئەمما لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێرە شوێنی تەرخان کراوی ئەو باسە نیە تەنیا بە ئاراستە کردنی چەند پرسیارێك بۆ ئەوانەی بڕوایان بەو بیرۆچکە هەیە واز دێنین:

یەکەم: چۆن زانرا کە مادده ئەزەلـــی یە و کەس نەی هێناوەتە دی، خۆ کەس ناتوانێ بڵێ ئاگام لە حاڵ و باڵی مادده هەبووە بەر لە دروست بوونی بوونەوەر، واتە بەر لە دە بلیۆن ساڵ (10.000.000.000.000) ﴿سـەیری کتێبی (از کهکشان تا انسان) بکە ، لاپەڕە (11)﴾ مادام کەسێکیش ئاگاداری بارودۆخی ئەو سای مادده نیە، پێم ناڵێی بە چ کلۆجێك دەگونجێ قسەی لێ بکا و حوکمی بەسەردا بدات ! مەگەر ئەو جۆرە ڕەفتارە بێجگە لە گومان پەرستی و تفەنگ بە تاریکایی یەوە نان ناوێکی دی هەڵدەگرێ ؟!!

دووەم: ئەگەر ڕاستە مادده ئەزەلی یە و کەس نەی خوڵقاندوە، چما ئەم بوونەوەرە ڕەنگین و پڕ وردەکاری یەی بەر لە دە بلیۆن ساڵ نەدەخوڵقاند ؟!

واته چ شتێك وای لـه مادده كرد كه دروست كردنی بوونەوەری بێ دواخات و بۆچی هەر لـه ئەزەلـەوە بوونەوەری دروست نەدەكرد؟! خۆ ژیریی و تێ گەیشتنی نیە تاكو بڵێی وای بە باش زانی !!

سێیەم: بێ باوەڕانیش وەك مەی بڕوادار دەڵێن ئەم بوونەوەرە ئەزەلی نیە و سەردەمێك بووە كە ناوی لـە كوولـەكەی تەریش دا نەبووە، كەواتە بۆمان هەیە ئەم پرسیارە لـە مادده پەرستان بكەین:

باشە چ شتێك پاڵی بە ماددەوە نا، كە چیدی لـە حاڵەتی ماددەی ساكاردا نەمێنێتەوە خۆی لـە شێوەی بوونەوەردا ڕێك خات! خۆ ئێوە بۆ خۆتان دانی پێدا دێن كە مادده خاوەنی ویست (ئیرادە) نیە ؟!!

چوارەم: لـەم بوونەوەرەدا ئەوپەڕی ڕێك و پێكی و یاسا و وردەكاری دەبینرێ و مەحاڵیشە ماددەیەك كە مادده پەرستەكان بۆ خۆیان دەڵێن: نە خاوەن ژیریی یە نە بەزەیی نە ئیـرادە نە هیـچ سیفەتێكی دیكەی پێویست بۆ زاتێكی بەدی هێنەر، چۆن توانی بوونەوەرێكی وا بخوڵقێنێ ؟!!

ئایا ئەوە وەك ئەوە نیە بڵێی : كابرایەكی كەڕ و كوێر و نەزان و نەخوێندەوار كتێبێكی داناوە هەزاران بیردۆزەی گیانەوەرزانی و فیزیایی و كیمیایی تێدایە !!

پێنجەم: ئینسان خاوەنی گیان و ژیری و ئیرادە و بەزەیی و قسە كردن و بیستن و .. هتدە ، باشە هەی مادده پەرستە بیر تەسكەكان چۆن ماددەیەك كە هیچ كام لـەو خەسڵەتانەی تێدا نیە، دەتوانێ ئینسانێك بخوڵقێنێ و هەموو ئەو خەسڵەتانەشی بەش بدات كە بۆ خۆی لێیان بێ بەشە !! مەگەر ئەو جۆرە بیركردنەوە و ئەو تەرزە قسە كردنە، ناماقووڵانەتر و ساویلكانەتر نیە لـە قسەی كابرایەك كە هیچ جۆرە میوەیەك شك نابات بەڵام دەڵێ : هۆ خەڵكینە كێ سێو و هەنجیر و هەنار و ترێ و پرتەقاڵ و هەرمێ و قەیسی و .. هتدی گەرەكە با بێتە لام، هەر جۆرە میوەیەكی بیەوێ پێی دەبەخشم ؟!!

شەشەم: ئێمە مادام هەر ناچارین پەنا بەرینە بەر شتێكی ئەزەلی تاوەكو دروست كرانی ئەم بوونەوەرەی پاڵدەینە لا، ئایا وا ماقووڵ تر و وێ چووتر نیە لـە باتی ماددەیەكی بێ گیانی كەڕی بێ ئیرادەی بێ عەقڵی كوێری لاڵی ناتوانا، بڕوا بە پەروەردگاێكی خاوەن ژیان و ئیرادە و زانا و بە دەسەڵات و بیسەر و بینا و گۆیا و كاربەجێ و بە بەزەیی بێنین؟!

واته ئایا كامیان لـە خوا و لـە مادده لێوە شاوەترن بۆ بەدی هێنەرایەتی و پەروەردگارایەتی ؟!!

ئەوە بەركوڵێك بوو سەبارەت بە بیردۆزەی ئەزەلـیەتی ی مادده ، كە پێم وایە هەر كەسێك لـوێچێك ژیری و لێكدانەوەی هەبێ و لغاوی بەدی بیردۆزە و میردۆزانی لـە زاری توند نەبوو بێ و

## ئاڵقەی دووەم

# وتووێژی دووەم: ئیسلام ئیسلامە نە ئایدیالیزمە نە ماتریالیزم

**کات: مانگی دووی ساڵی 1982ز**

**شوێن: دێی (ز)**

.. زستان بوو ، پەروەردگاری باڵا دەست بە پەنجەی نیگارکێشی خۆی شاخ و داخی کوردستانی وەك کچۆڵەی تازە بووك بە تارای زیوینی لە بەفر چنراو ڕازاندبۆوە و بەفر و شڵت و شۆ هەموو جێ و ماوای وەبەرخۆ دابوون و بەڕێدا ڕۆیشتن هەتا بڵێی سەدەمەو ناهەموار و پڕ ئێش و ژان بوو، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە چوار مانگ دەبوو لە ماڵێ وەدەر کەوتبووم و چ سەرو سۆراغیشم نەبوون، سەبارەت بە ماڵێ بە پێویستی یەکی ئیسلامیم زانی سەرێکی لێ هەڵێنم و حاڵ و باڵیان بزانم [1] .

هاتم گەیشتمە دێی (ز) کە پێڕی (ی)ی لێ بوو، ویستم برێك وەحەسێم و لە ژیان و گوزەرانیشیان ئاگادار بم، کە لێیان وە ژوور کەوتم سەرنجم دا پازدە

---

قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوێ ڕێی لێ نەگرتبێ پێی ئیقناع دەبێ، ئەمما شوێنی تەرخان کراوی توێژینەوەی ئەم مەسەلەیە و هەموو ئەو باسانەی پەیوەندی یان بە خواناسی یەوە هەیە کتێبی " گەورەترین ڕاستی"یە کە خوا پشتیوان بێ زۆر ناخایەنێ دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەران.

تێبینی : دوایی لە ساڵی (2000) ز دا کتێبی (گەورەترین راستی) یان راستتر بڵێم : ئەو ئەندازەیەی کە لەو کتێبە مابۆوە، لەژێر ناوونیشانی : (( خواناسی ، ئایین ، ئیمان : راستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە )) دا چاپ کرا .

(1) واتە بابم و دایکم و خوشك و برایەکانم چونکە ئەو کاتە سەڵت بووم و ژن و ماڵم نەبوو .

کەسێك دەبوون، جا تێیان دا هەبوو لە پلە و پایەدا ژوورڕابوو هەشیان بوو ژێر ڕابوو و مام ناوەندی یشیان تێدا بوو.

کاتی نوێژی شێوان هات و هەستام بچم دەست نوێژی هەڵگرم، من سەرگەرمی دەست نوێژەکەم بووم کە یەکێکیان لێم هاتە پێشەوە و گوتی:

_ ئەوە خەریکی چی کاکە؟

+ دەمەوێ دەست نوێژێ هەڵگرم.

_ دەست نوێژ ! دەست نوێژی چی، بۆ نوێژانیش دەکەی ؟!!

+ بەڵێ، بۆ هیچ لە گۆڕێدا هەیە؟

_ نەء بەڵام پێم سەیرە کە بڕوات بەو شتە پڕو پووچانە هەیە.

+ وا دیارە جەنابت بڕوات بەو جۆرە مەسەلانە نیە !

_ نەخێر .

+ باشە بۆ نایەی لەو بارەوە دوو بە دوو بدوێین ؟!

_ کاتی خۆم لەو چەشنە باسانەدا بەزایە نادەم.

ئەوەی گوت و لێیدا ڕۆیی، هەرچەندە یەك دوو جاریش لێم دووبارە کردەوە، کە پێم خۆشە پێکەوە وتووێژ بکەین بەڵام ئەو نەی بیست... هەڵبەتە نوێژکەر هەر من بووم، بۆیە کاتێك لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا باڵتۆم ڕاخست وقامەتم خوێند و تێکەڵی نوێژەکەم بووم، چاویان لێ کردمە درێشە و وا دیار بوو هەستیان بە دیمەنێکی ڕیز پەڕ و سەرسورهێنەر دەکرد و زۆر لەمێژ بوو دیاردەی نوێژ کردن و خواپەرستی یان بە چاوان نەدی بـــوو!!

لەبەر ئەوەی ڕێبوار بووم بۆم هەبوو نوێژێ شێوان و خەوتنان پێکەوە بکـەم بە کورتکردنەوە و کۆکردنەوە (قصر و جمع)، بۆیە نوێژێ خەوتنانیشم

هەر بە دوای ئی شێوان داکرد، سەرتان نەیەشێنم بە کاوەخۆ نوێژو ویردو دوعاکانم تەواو کردن و لەو دەمەیدا یەکیان  کە لە دوایی دا زانیم ڕیشی سپی و مامۆستایانە  گوتی:

_ هەرچەند لەوانەیە پێشت ناخۆش بێ بەڵام ئەو شیعرەی مامۆستا (هێمن) هەر دەخوێنمەوە کە دەڵێ:

دیم کچێکـــی لە بـــاری لادێیی

بۆ نوێـــژ ڕادەخـــا بەرەڵـــبێنـــێ

گوتم ئەی نازەنین کە ڕوخسارت

هەموو باخی بەهـــاری خوا دێنـــێ

بۆچی پێت وایە ئەو خودا گەورە

هێنـــدە بێ ڕەحمە تۆش بسـوتێنێ؟ !!

جا توخوا هێمن ڕاست ناکات ستەم نیە خوا کچە کوردێکی ماندومجرۆ و سەرقاڵ بە ئاگری بسووتێنێ هەر لەبەرئەوەی نوێژی نەکردوە [1] ؟!

+ با ، بە مەرجێك ئەو کچە لادێییە یان هەر کەسێکی دیکە مەودای نەبێ ئەو ئەرکەی بەجێ بێنێ و خوای کاربەجێ و بە بەزەییش پاکی بۆوی لەگەڵ هەبوونی عوزریش دا هەر سوور بێ لەسەر سووتاندنی، لە ڕوانگەی ئێمەی مرۆڤەوە بە زوڵم و ستەم حسێب دەکرێ، بەڵام هەر کام لە ئێمە ئەگەر لە خۆی نەگۆڕێ و لە ڕاست هەق دا چاوان لە قووچ نەنێ کیژ و کوڕ و ژن و پیاوی کورد و غەیری کوردیشی دیوە، کە لە جەنگەی سەرقاڵی و کارو کاسبی دا ئەرکی بەندایەتی خۆیان بەجێ هێناوە بێ ئەوەی هەست بە

(1) واتە مادام ئەمن ڕێبوارم و ماندووم پێویست ناکات نوێژێ بکەم !!

بارگرانی و نارەحەتی بکەن، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئیسلامەتی بەرنامەیەکە وەك کالاّ بە بالاّی ئینسان بڕاوە و بە گوێرەی سروشتی وی دانراوە و لە هەموو بەند و یاسایەکی دا ئاسانی و نەرم و نیانی لەبەرچاو گیراوە[2] .

_ من دەلێم ئەو قسەیەت ڕاست نیە و ئەگەر ترسی کوتەکی دۆزەخ و تەماعی بە بەهەشت گەیشتن نەبێ کەس خوا ناپەرستێ و گوێ ناداتە فەرمانەکانی.

+ هیچ کەس نکوولّی لەوە نیە کە ترسی دۆزەخێ و تەماعی بەهەشتێ پالّنەرێکی بنەڕەتی و کاریگەرە، بەلاّم..

لێرەدا قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

_ کەواتە مارکس کە دەلێ: ئابووری بنچینەی هەموو جم و جۆلّ و چالاکی و دیاردەکانی کۆمەلّگایە و ئەوەی کە سەروسیما و خەسلّەتەکانی هەر کۆمەلّگایەك دیاری دەکات، لە ئاین و هونـەر و سیاسەت و ڕۆشنبیری و.. هتد بارودۆخی ئابووری ئەو کۆمەلّگایەیە، شتێکی ڕاست و بەجێی گوتوە، چونکە ئێوەی موسلّمانیش کە واز لە ژیانی دنیا دێنن و دەکەونە سـەر خواپەرستیی بەو هیوایە ئەوی دەکەن کە خوا لەو دونیا ژیانێکی چاکتر و تەواوتر و درێژ خایەن ترتان بداتێ کە پێی دەلێن: بەهەشت.

+ سێ تێ بینیم هەن لەسەر ئەم چەند قسانەی ئێستا بەسەر زارت دا هاتن:

1- مارکس و مارکسی یەکان یەکەم کەس نین کە پەییان بە گرنگی و کاریگەری ئابووریی بردوە لە ژیانی کۆمەلّگادا، ئیسلام (1200)

(2) خوا لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ البقرة 185، واتە: خواوەند دەیەوێ شت تان بۆ ئاسان کات و نایەوێ لەسەرتان گران کات.

ساڵ پێش چاو بە دنیا هەڵێنانی مارکس ئەو ڕاستی یەی ڕاگەیاندوە و دەیان دەقی ئیسلامی‌مان هەن لەو بارەوە بەس ئێستا دەرفەتی خستنە ڕوویانمان نیە[1] .

2- موسڵمانان حەوجێی ئەوەی نین بۆ خاتری وەی ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی بەرین وەدەست بێنن، واز لە ژیانی دنیا بێنن و دەست بدەنە گۆشەنشینی، چونکە لە ڕێبازی ئیسلام دا دژایەتی و ناکۆکی لە نێوان دنیا و دوا ڕۆژدا نیە، بەڵکو هەر کامێکیان پێویستی بەوی دیکەی هەیە و یەکدی تەواو دەکەن.

3- موسڵمانەتی و خواناسی پلە پلەیە و پلەی هەرێ خوارێی ئەوەیە کە لە ترسی دۆزەخ و بە ئومێدی بەهەشتێ بێ، بەڵام کاتێك موسڵمان بە پەیژەی خواناسی دا پێهەڵا دەچێ و بەرەو ژوور دەڕوات، تەنیا بەجێ هێنانی ئەرکی بەندایەتی و ڕازی کردنی خوا دەبێتە پاڵنەر و ئامانجی پابەند بوونی بە بەرنامەی خوداوە، واتە بڕواداری کامڵ و تەواو ئەو کەسەیە کە چاو لە غەیری خوا بپۆشێ و تەنیا بۆیە خوا بپەرستێ و گەردن کەچی ی بۆ بکات، چونکە خۆشی دەوێ و لەزەت و چێژ لەو فەرمانبەریی و خواپەرستی یە وەردەگرێ و خۆی بە قەرزدار و منەت بار دەزانێ و خوای بێ هاوتاش بە شیاوی پەرستن[1] .

_ کەواتە بەرزترین پلەی موسڵمانەتی و خواپەرستی بریتی یە لە ئایدیالیسم.

---

(1) لە وتووێژی پێنجەم دا کە ئەڵقەی پێنجەمی ئەم زنجیرەیەیە و تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەی مەسەلەی دادگەریی کۆمەلایەتی هەندێك لەو دەقانە خراونەتە ڕوو.

(1) شۆڕە ژنی خواناس (رابعة العدوية) فەرموویەتی: نە لە ترسی دۆزەخ و نە بۆ خۆشی بەهەشتێ خوا نایەرستم، بەڵکو بۆیە دەیپەرستم چونکە ئەو خوامە و منیش بەندەمی !!

+ ئیسلام ئیسلامە نە ئایدیالیسمە و نە ماتریالیسم.

_ وا دیارە ئەو ئیسلامەی تۆ ئیسلامێکی سەربەخۆ و جویێە لەوەی ئێمە دەیناسین !!

+ برا گیان ئەو ئیسلامەی من لە ئەنجامی حاڵی بوون و تێ گەیشتنم دا لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ ، بۆم دەرکەوتوە ئاوایە، ئەمما بریا بۆم ساغ بووبایەوە تۆ لە چ سەرچاوەێکەوە بۆت دەرکەوتوە کە ئیسلام بریتی یە لە ئایدیالیسم (المثالیة) .

یەکێك لە دانیشتوان گوتی:

_ کاکە وا مەزانە مامۆستا ( _ ) هیچ لە ئیسلامەتی یە نازانێ، هێندەی مەلایەکی دوازدە عیلم شارەزایە ! وەختی خۆی لە کن مەلاش دەرسی خوێندوە !

+ بەڵێ بەڵێ دیارە کە بەقەد مەلایەکی دوازدە عیلم دەزانێ، بۆیە ئاوا لە ئیسلام حاڵی بووە !.

یەکێکی دیکە لە دانیشتوان گوتی:

_ وەڵڵا ئەوە یەك ببیستم کە ئیسلام ڕێبازێکی سەربەخۆیە و نە ئایدیالیسمە و نە ماتریالیسم، باشە کاکە ئەگەر زەحمەت نەبێ بۆمان ڕوون ناکەیەوە چۆن ئیسلام نە ماتریالیسمە و نە ئایدیالیسم ؟!!

+ بەرێ وەڵڵا بە چاوان، برایان ئیسلام وەبەر پێڕی ئایدیالیسم ناکەوێ چونکە بڕوای بە واقیعییەتی ئەم جیهانە ماددی یە و دیاردە سروشتی یەکان هەیە و بوون (وجود) لە چوارچێوەیەکی فیکری ڕووت دا کورت هەڵنایەنێ و بە چاوی بایەخ پێ نەدان و بە کەم سەیر کردن ناڕوانێتە لایەنە ماددیەکانی ژیان و لە ڕێچکەی ماتریالیسم پتر باوەڕی بە جیهانی بەرهەست هەیە و

لەویش زیاتر شوێن کەوتووانی هەڵدەنێ بۆ مەیسەر کردنی دیاردە سروشتی یەکان لە ڕێی پەی بردنەوە بە یاسا و دەستوورەکانی بوونەوەر، بە هیوای ئەوەی کەڵکیان لێ وەرگرن و شەقڵێکی کاریگەر بخەنە نێو ژیانەوە و **لەبەرەو ژوور بردنی ئاستی ژیار و ئاوەدانی[1] مرۆڤایەتی‌ی‌دا پشکی خۆیان**

---

(1) دەقی ئیسلامی لەو بارەوە یەکجار زۆرن بۆ وێنە:

خوای کاربەجێ لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ ﴾ (61).

واتە: بۆ کن نەتەوەی (ثمود) سالحی برایانمان نارد ﷺ پێی گوتن: گەلۆ خوا بپەرستن غەیری وی چ پەرستراوی دیکەتان نین، ئەو لە زەوی‌دا خولقاندوونی و ئاوەدان کردنەوەیشی عایدی ئێوە کردوە، دە داوای لێبوردنی لێ بکەن و تۆبە بکەن، بە ڕاستی پەروەردگارم فرە نیزیك و بە دەنگەوە هاتوە.

دەبینین لەم ئایەتەدا (صالح) سەلامی خوای لێ بێ بە گەلەکەی دەڵێ: خوای کاربەجێ ئاوەدان کردنەوە و بنیات نانی شارستانەتی لەسەر زەوی‌دا بە ئێوە سپاردوە ! بە ڕاستی مرۆڤ هەتا لە وشەی (استعمرکم) ورد دەبێتەوە زیاتر ئەو وشە و زاراوانەی بەزەیی دا ڕادەبرن کە پەیوەندییان لەگەڵ : ئابووری و سیاسەت و پیشەسازی و بازرگانی و ... هتد هەیە، چونکە وشەی (استعمار) کە هەوەڵ جار نووسەرە عارەبەکان دوایش ئێمە بە هەڵە لە بری ئیمپریالیزم و داگیرکەر بەکاری دێنین، مانا ئەسڵی و ڕاستیەکەی بریتی یە لە "ئاوەدان کردنەوە" تەنانەت ئێمەی کورد زمان هەتا ئێستاش وشەی (تەعمیر) بە مەبەستی چاکردن و بووژاندنەوە بەکاردێنین.

کەسیش ناتوانێ لەوە لامل بێ کە ئاوەدانی و ژیار بە بێ پەرەپێدانی هەموو بابەتەکانی زانست لە زیندە خەونێ بەولاوە چیدی نیە، کەواتە بەرنامەی خوا کە فەرمان بە ئینسان دەکا زەوی ئاوەدان بکاتەوە و شارستانیەتی تێدا بنیات بنێ هەر لەو کاتیش دا فەرمانی پێ کردوە کە لە گشت بوارەکانی زانست دا کارامە و پسپۆڕ و شارەزا بێ، ئایینێکی ئاواش لەویەڕی نەفامی و سادەبیری ی نەبێ ڕێ بە مرۆڤ نادات تۆمەتی گرنگی نەدان بە ژیانی پاڵ داتە لا.

ئەو نەفام و ساویلکانە وا دیارە بێ خەبەرن لەوە کە ئیسلام تەنانەت لە ڕۆژی هەینی دا  که جیژنی موسڵمانان و ڕۆژی کۆنگـره بەسـتیانە  بە موسـڵمانانی فەرموە کە دوای نوێـژێ بە دووکار و پیشەیان دا بڕۆن، ئاشکراشە کە دەست بزاوتن و ئیش کردن ڕەگ و شادەماری ئاوەدانی و ژیارە

﴿ فَإِذَا قُضِيَتْ الصَّلاَةُ فَانتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ ﴾ الجمعة 10.

وە وا دیارە ئەوانە بێ خەبەرن کە ئیسلام دەڵێ: خوا زەوی بۆ بەردەست کردون دەبڕۆن بە نێو گرد و نشێوەکانی دا و سوود لە نیعمەتەکانی خوا ببینن:

﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ الملك 15.

وە بێ ئاگان لەوە کە ئیسلام دەڵێ: حەڵاڵ ترین ڕۆزی ئەوەیە کە بابایەکی وەستاو خاوەن پیشە وەدەستی هێنابێ : **((احل ما اكل العبد كسب الصانع اذا نصح))**رواه احمد. وە ئاگایان لەوە نیە کە ئیسلام دەڵێ: بازرگانی ڕاستگۆ لەگەڵ شەهیدان و پیاو چاکان دا حەشری دەکرێ: **(( التاجر الصدوق يحشر يوم القيامة مع الصديقين والشهداء))** رواه الترمذي. وە نەیان بیستوە کە لە ڕێبازی ئیسلام دا موسڵمانی خاوەن پیشە ئازیزی خوایە: **(( ان الله يحب المؤمن المحترف ))** اخرجه الطبراني.وە بێ ئاگان لەوەی کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تێکۆشان لە پێناوی خۆ ژیاندن و حەوجێ نەبوون بە خەڵکی ، وەیان لە پێناوی دایك و باب و منداڵ و خێزان دا تێکۆشانە لە ڕێی خوادا: **(( ان كان يسعى على نفسه ليكفها عن المسئلة و يغنيها عن الناس فهو في سبيل الله، وان كان يسعى على ابوين ضعيفين او ذرية ضعاف ليغنيهم و يكفيهم فهو في سبيل الله..)) اخرجه الطبراني.** وە بێ خەبەرن لەوەی کە ئیسلام بە ئیشی لام سەلـلایی و نارێك و پێك قایل نابێ , دەڵێ سەلیقە و وردەکاری لە ئەنجام دانی ئیش وکارتان دا بەکاربێنن چونکە خوای زانا ئیشی ڕێك و پێك و پڕ وردەکاری خۆش دەوێ: **(( ان الله يحب اذا عمل احدكم عملا ان يتقنه ))** . اخرجه البيهقي.

ئەوە سەبارەت بە مشوور خۆری ئیسلام و بە تەنگەوە بوونی بۆ بەرەو پێش بردنی ژیار و پێهەڵا بردنی ئاستی ژیان و گوزەران، ئەمما سەبارەت بەوەی کە ئیسلامەتی وەك شتێکی واقیعی و بەرچاو لە جیهان دیاردە سروشتییەکان دەفکرێ و میسالییانە بە سێبەر و خەیاڵیان دانانێ، دەقی ئیسلامی لەو بارەوە زۆرن : خوای باڵا دەست و بێ هاوتا دەفەرموێ :

﴿ أَفَلاَ يَنظُرُونَ إِلَى الإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ، وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ، وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ، وَإِلَى الأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ" ﴾ (الغاشية 17، 18،19، 20)

واته: ئەرێ بۆ ناڕوانننە حوشترێ چۆن خولقێنراوە ، وە ئاسمان چۆن بڵند کراوە، وە چیاکان چۆن داکوتراون، وە زەوی چۆن پان و پۆڕ کراوە؟ دەبینین لێرەدا خوای مەزن بە لۆمە کردنەوە دە ئینسانەکانەوە دەخوڕێ، کە لەو دیمەن و دیاردە سروشتی یانە ورد بنەوە و تێیانەوە ڕامێن و پەی بە نهێنی یەکانیان بەرن، لە جێیەکی دیکەدا خوای زانا و قسە لەجێ ئاوا بە بەندەکانی دەفەرموێ :

**( أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ (58) أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ (59) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (60) عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لاَ تَعْلَمُونَ (61) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الأُولَى فَلَوْلاَ تَذَكَّرُونَ (62) أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ (63) أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ (64) لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ (65) إِنَّا لَمُغْرَمُونَ (66) بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (67) أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (68) أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ (69) لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلاَ تَشْكُرُونَ (70) أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ (71) أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ (72) ﴾ الواقعة من 58 الى 72.**

یانی: ئایا سەرنج تان نەداوەتە ئەو تۆو (مَنـّي )ەی دەی ڕێژن، ئایا ئێوە وەدی دێنن یان ئێمە؟!.. ئایا لەوە ورد نەبوونەوە کە دەی چێنن، ئێوە دەی ڕوێنن یان ئێمە ؟!.. ئایا ئەو ئاوەتان دیوە کە دەیخۆنەوە، ئێوە لە هەورانی دێننە خوارێ یان ئێمە ؟!..

ئایا لەو ئاگرە ڕاماون کە هەڵی دەکەن، ئایا ئێوە دار (سووتەمەنی)ە کەیتان ڕەخساندوە یان ئێمە ؟!

لەم کۆمەڵە ئایەتەش دا خواوەند دەیەوێ چاوو مێشکی بێ ئاگا و خەواڵووی ئادەمی بێدار کاتەوە و بە پریشکی چەند تابلۆیەکی زێدە دڵڕفێنی سروشت خەوێ لێ برەوێنێ، ئەو تابلۆیانەش ئەمانەن: چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ ، ڕووانی ڕووەك و کشت و کاڵ، ئاوو باران بارین، ئاورو سووتەمەنی، کەواتە سەرجەمی ئەو دیاردە سروشتی‌یانەی لە دوو کۆمەڵە ئایەتی سوورەتی (الغاشیة) و (الواقیعة) دا دەبینرێن هەشت دیاردەی سەرەکین:

1- ئـاژەڵ (حوشتر) 2- ئاسـمان 3- شـاخەکان 4- زەوی

5- مرۆڤـ 6- کشت و کاڵ 7- ئـاو 8- ئـاگر.

جا ئێستا دەمەوێ سەرنجێکی قووڵ تر لەوان دوو کۆمەڵە ئایەتان بدەین و زیاتر بۆیان ڕۆچیـن:

ئایەتی یەکەم کە قسە لە دیاردەی یەکەم (ئاژەڵ) دەکات، ئاوا لـێی دەدوێ:

ئەوە سەیری حوشترێ ناکەن چۆن دروست کراوە؟.

باشە دەبێ بۆچی ئەم شێوازە تەعبیرە بەکار هێنرابێ؟ ئایا ئەگەر گریمان ئایەتەکە ئاوا بایە "انظروا الی الابل" تەماشای حوشترێ بکەن، چ جیاوازییەکی دەبوو لەگەڵ شێوە تەعبیری ئایەتەکەدا؟! لە وەڵام دا دەڵێین: فەرقێکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوو شێوە تەعبیرەدا چونکە کە گوترابا (سەیری حوشترێ بکەن) هەر هێندە پێویست بوو نیگایەك بخشێنرێ بە کەلەش و سەروسەکوتی حوشترێ دا ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ، بەڵام کە گوترا : (ئەوە چما سەیری حوشترێ ناکەن چۆن خوڵقێنراوە ؟!) دوو یاسای نوێ سەر هەڵدەدەن:

یەکەم: کە لە ڕستەی (أفلا ینظرون) دا سەر هەڵدەدات، ئەوەیە کە بابای دوێنراو (مخاطب) وریا دەکاتەوە کە دەبوو لەمەوپێش ئەو کارەی بەجێ هێنابایە، چونکە تۆ کە بە یەکێکت گوت: ئەوەبۆ فلان ئیشە ناکەی؟ مەبەست ئەوەیە کە دەبوو پێشتر کردبای.

دووەم: کە لە ڕستەی (کیف خلقت)دا سەرهەڵدەدات ، ئەوەیە کە تەماشا کردنی بەتەنێ بەس نیە، چونکە تۆ کاتێك بۆت دەردەکەوێ کە فلانە ئاژەڵ یان فیسارە ئامێر چۆن دروست کراوە، کە بە سەرنج دانی سەرپێیی وازنەیەنی و بۆی بچیە نێو دەریای وردبوونەوەی و لێکۆڵینەوەی عیلمیانە و ئەزموونی یانە. دە ئێستا خوێنەری بەڕێز: ئەم سەرنج گرتن و توێژینەوەیەی کە لەبەر تیشکی ئایەتی یەکەم دا سەبارەت بە دیاردەی یەکەم (ئاژەڵ) کردمان، بیکە بە سەنگی مەحەکی گشت دیاردەکانی دیکە و بزانە چ ئەنجامێکت دەسگیر دەبێ و بە چ ئاکامێك دەگەی !

بزانە: چما لە دیاردەی دووەم (ئاسمان)دا نەگوتراوە : (سەیری ئاسمانێ بکەن) و بێژراوە (چما سەیری ئاسمانێ ناکەن چۆن بڵند کراوە؟ ) وە لە دیاردەی سێیەم (شاخەکان) دا نەگوتراوە (تەماشای شاخان بکەن) و گوتراوە : ( بۆ سەرنجی شاخان نادەن چۆن داکوتراون؟)، وە لە دیاردەی چوارەم (زەوی)دا نەگوتراوە (سەیری زەوی بکەن) و گوتراوە: (بۆ لە زەوی نافکرن چۆن پان ڕاخراوە؟)، وە لە چوار دیاردەکەی دیکەدا بۆچی هەر بە هێندێ لێ نەگەڕاوە کە بڵێ: تەماشایان بکەن و بیرو زەینی مرۆڤ پاشە و پاش کشێنراوەتەوە بۆ دوای دوایە و بەو جۆرە لە دیاردەی (مرۆڤــ)دا قۆناغی هەوەڵی دروست بوونی کە حاڵەتی تۆو (مَنّي)ایەتی یە دەخرێتە بەرچاوو، لە دیاردەی (کشت وکاڵ)دا دوو قۆناغی چێندران و سەوز بوون و لە دیاردەی (ئاو) دا مەسەلەی هەورو باران بارین و لە دیاردەی (ئاگر)یش دا باسی داروبار و سووتەمەنی یەکەی کراوە ؟!!

ئایا ئەگەر هیچ چەمکێك لەو جۆرە شێواز و تەعبیرە بفامرێتەوە ئەوە نیە کە ئیسلام هەر بە هێندێ ڕازی نابێ مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرپێیی و سەیری دیاردە سروشتییەکانی دەوروبەری

بکا و، دەیەوێ لەسەر بنچینەی زانیاری و ئەزموون تێیانەوە ڕامێنێ و، بزانێ چۆن چۆنی هاتوونە دی و لەچی پێك هاتوون و چۆن کار دەکەن ؟!

ئایا بۆ خاتری وەی بزانین حوشتر که نموونەیە بۆ عالەمی ئاژەڵ چۆن و لە چی دروست بووە و، ئاسمان چۆن بەرز کراوەتەوە و، شاخەکان چۆن داکوتراون و زەوی چۆن ڕاخراوە و، مرۆڤ چۆن لە تۆو (مَنّي)ی دروست دەبێ و، ڕووەك چۆن شین دەبێ و دەڕوێ، ئاو چۆن لە باران و باران چۆن لە هەور پەیدا دەبێو ، ئاور چۆن لە ئەنجامی سووتاندنی سووتەمەنیدا دێتە دی بەڵێ ئایا بۆوەی چۆنیەتی دروست بوون و پێکهاتنی ئەم دیاردانە بزانین و وەك ڕوونیشمان کردەوە زانینیان خواست و داواکاریی خوایە ئایا هەموو زانیارییەکانی : پزیشکی و دەروون ناسی (سایکۆلۆجیا) و توێکاری (فسیۆلۆجیا) و زیندەوەرزانی و ڕووەك ناسی و زەوی ناسی (جیۆلۆجیا) و گەردوون ناسی و کیمیا و فیزیا، لازم و پێویست نین بۆ ئەوەی بتوانین بە دەنگ بانگی خواوە بچین و چۆنیەتی دروست بوون و کارکردنی دیاردە سروشتییەکانی دەروبەرمان بزانین ؟!!

مادام وابێ ئێستا دەتوانین بە ڕاشکاوی ڕای گەیەنین:

کە فێر بوون و سوود وەرگرتن لە هەموو زانیاری یە سروشتی یەکان (العلوم الطبيعية) لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی فەرزە، چونکە وەك لە تەفسیر و ڕاڤە کردنی دوو دەستە ئایەتی سووڕەتی (الغاشية و الواقيعة)دا بۆمان ساغ بۆوە، زانین و پەی بردن بە دیاردە سروشتی یەکان داواکاری خوایە، ئینجا وەك پێشتر ڕوون بۆوە زانیمان کە پەی بردن بە دیاردە سروشتی یەکان بە سەرنج دان و تێ ڕوانینی هاکەزایی و سەرپێیی شتێکی چاوەڕوان نەکراوە، بەڵکو شارەزایی و پسپۆری لە هەموو لقەکانی زانیاری دا بۆو مەبەستە پێویستە، ئینجا بە دەردی زانایانی (اصول الفقه) دەڵێن: "ما لا يتم الواجب الا به فهو واجب" هەر شتێك بەجێ هێنانی فەرزێکی پەکی لەسەری بکەوێ دەبێتە فەرز، کەواتە: زانین و فێر بوونی ئەو زانیارییانەی پێویستن بۆ ناسین و پەی بردن بە دیاردە سەرنج ڕاکێش و پر وردەکارییەکانی بوونەوەر لەسەر ئوممەتی ئیسلامی فەرزە ناڵێین لەسەر هەر موسڵمانێك چونکە لە توانا بەدەرە .

ئەوەی گوتمان رایەکی شەخسی نیە و زانایانی ئیسلامی لەسەر ڕێك کەوتوون.

پێم وایە ئەم برە توێژینەوەیە بەسە هەر چەند لوێچێکیشە لە تەغارێك بۆ وەدرۆ خستنەوەی ئەو نەفام و سادە بیرانەی کە دەڵێن: ئیسلام بیرو باوەڕێکی میسالی یە و بڕوای بەم جیهانە ماددی یە بەرهەستە نیە و لەگەڵ ڕەوتی بەرەو پێش چوونی کاروانی مرۆڤایەتی دا ئاسازێ.

**ڕەگەڵ خەن، ئاشکراشە کە ئایین و بەرنامەیەکی وا بە هیچ ڕەنگێك ڕەوا نیە پێی بگوترێ ئایدیالیسم.**

بەڵێ ڕەوا نیە تۆمەتی میسالێتی بۆ ئینسانی مسوڵمان ساز بکرێ و قوڕی ئایدیالیسم بە نێوچاوانی ئیسلامەوە بنرێ ، چونکە ئیسلام هانی مرۆڤ دەدا و لە هاندانێش بەولاوە لەسەریشی پێویست دەکا کە لە قاوغ و قەپێلکی شەخسی خۆی بێتە دەرێ و لەگەڵ دەوروبەردا پەیوەندی یەکی کاریگەرانەی هەبێ و فەیلەسووف ئاسا نەچێتە نێو بورجێکی عاجی یەوە و بڵێ هەر هێندە لە دنیایەدا هەیە کە بۆ خۆم بیری لێ دەکەمەوە هەستی پێ دەکەم و هەر لەگەڵ چاوم لێك نان هیچ شتێك لە گۆڕێدا نامێنێ.

ئەوە سەبارەت بە (ئایدیالیسم)[1] نەبوونی ئیسلام، ئەمما سەبارەت بە (ماتریالیسم)[2] نەبوونی، شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئیسلام ناڵێ مادده

---

(1) وشەی ئایدیالیسم (المثالية)، لە بنەڕەت دا یۆنانی یە لە سێ بەشان پێك هاتوە (ئیدە) واتە : تێڕوانین، (ئەل) کە ئامرازی نسبەتە، (ئیسم) واتە: مەکتەب و بەرنامە. ئایدیالیسم بە شێوەیەکی گشتی بەو چەشنە فەلسەفەیە دەڵێن کە چەمکە زەینی‌یەکان (المفاهيم الذهنية) بە سەرچاوەی پەی بردن بە دەوروبەر حسێب دەکات. بێگومان ئەم وشەیە بە زۆر مەبەستی جوێ جوێ بەکارهێنراوە.

بۆ وێنــە : هەر کام لە ئەفلاتوون و دیکارت و هیگل بە واتایەکی تایبەتی و جیا لەوانی دیکە بەکاری هێناوە، بەڵام ئەو چەمکەی کە مارکسیستەکان لە دڵی دەگرن لە کاتی بەکارهێنانی دا بۆ ئیسلام ئەو چەمکەیەتی کە ( بارکلی ) مەبەستی بووە، (ئایدیالیسم)ی بارکلیش بە کورتی بریتـــی یە لە :

بە نەبوو و هیچ سەیر کردنی جیهانی مادده و دیاردە سروشتی یەکان، تەنیا لە کاتێك دا نەبێ کە ئاوەز (عقل ) هەستیان پێ دەکات، واتە: بوونەوەر هەر بە نسبەت کەسێکەوە هەیە کە بیری لێ دەکاتەوە !!

تەماشای کتێبی : (پیرامون ایدیالیسم و رئالیسم) بکە، نوسراوی : محمد تقی مصباح.

ئەزەلی یە و بوونەوەر بێ پەروەردگار و سەرپەرشتە و ئینسان وەك کەری خوێڕی بەرهەڵدای وەڵاتی کراوە.

بەڵکو دەڵێ: مادده خوای بەدی هێنەر خوڵقاندوویەتی و، بوونەوەر پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و بەخشندە بەڕێوەی دەبا و مرۆڤیش جێگری خوایە و لە لایەن ویەوە بەرنامە و پەیڕەوی ژیانی بۆ ڕەوانە کراوە و ڕێنمایی کراوە.

_ کەواتە قسەی من ڕاستە کە دەڵێم: ئیسلام بیرێکی میسالی یە .

+ بۆچی ؟!

_ چونکە لە دنیادا تەنیا دوو جۆرە بیروباوەڕ هەن: یەکەم (ماتریالیسم) ئەوی دیکەش (ئایدیالیسم)، تۆش بۆ خۆت گوتت: ئیسلام (ماتریالیسم) نیە مادام وابێ دانت پێداهێناوە کە (ئایدیالیسم)ە.

+ برا گیان هەڵەی ئێوە لەوە دایە کە هەر بەرپەی خۆتان دەپێون و بەس لە ڕوانگەی تایبەتی خۆتانەوە سەرنجی دنیا دەدەن، بێ ئەوەی بزانن خەڵکی دیکە چ دەڵێ و چ ناڵێ.

ئەو قسەیە کە دەڵێ : لە دنیادا تەنیا دوو جۆرە بیروباوەڕ هەن، تەنیا قسەی هەگبە و گیرفانی بیردۆزی پووچی خۆتانە، مرۆڤیش چاك نیە هێندە مەغروور و لەخۆبایی بێ کە بێجگە لە قسەی خۆی ئی کەسی دیکەی بە گوێدا نەچێ، من کاتێك دەڵێم ئیسلام نە ئایدیالیسمە و نە ماتریالیسم دیارە لە ڕوانگەی دەلاقەیەکی دیکەی جودا لەوەی ئێوەڕا سەرنجی

(2) وشەی (ماتریالیسم)یش ڕاست وەك (ئایدیالیسم)ەو لە سێ بەشان دروست بووە (ماتەر) واتە: مادده، (ئەل) وە (ئیسم)، کە بە کورتی ئەمە مانا و چەمکەکەیەتی: مادده پەرستیی و بێجگە لە ڕواڵەت و دیاردە بەرهەستەکان بڕوا نەبوون بە هیچی دیکە .

مەسەلەکە دەدەم ، بێگومان بەڵگەشم بۆ هێنانەوە بۆ سەلماندنی میسالی نەبوون و ماتریالیسم نەبوونی ئیسلام، کە پێم وایە ئەگەر بە ویژدانەوە گوێتان لە قسەکانم ڕاگرتبێ بایی قەناعەت پێ هێنانی دەکرد.

یەکێك لە دانیشتوان گوتی:

_ بە ڕاستی پیاو هەقێ بلێ قسەکانت بەڕێ و جێن، ئەما پیاو درۆیە نەکات، ئێستاش بەوەی ئیقناع نەبووم کە ئایینی ئیسلام وەبەر شتاق لە ئایدیالیسم و ماتریالیسـمان ناکەوێ.

+ کوڕینە مەسەلەیەکی زێدە بایەخ دار ماوە، نەخراوەتە سەرخوانی باس و گفتوگۆ، پێم وابێ هەر ئەویشە ئێوەی دڕ دۆنگ کردوە، ئەو مەسەلەیەش ئەمەیە:

ئێمە کە دەڵێین ئیسلام نە ئایدیالیسمە و نە ماتریالیسم، مەبەستمان ئەوە نیە کە ئیسلام هیچ شتێکی هیچ کامیانی قبوولْ نیە، نەء چونکە ئیسلام لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕاستەو هەموو لایەنەکانی ڕاستی ی تێدایە، زۆر جاران لەگەلْ گەلێك لە ڕێچکەکان دا لەو لایەنانەیان دا کە ڕاستن یەك دەگرنەوە و پێك دەگەنەوە، بۆ وێنە: مارکسیزم کە ڕێچکەیەکی ماتریالیستی یە ئیسلام لە هەندێك لایەنی دا لەگەڵی دا یەك دەگرێتەوە، وەك لەسەر کردنەوەی هەژاران و وەدەنگ هاتن لەسەریان و چەسپاندنی دادگەری کۆمەلایەتی و بایەخ دان بە ئابووری و بە گرنگ سەیر کردنی زانیاری و تەکنۆلۆجیا[1] .

---

(1) لـێرەدا پێویستە دوو تێبینی بخرێنە ڕوو:

یەکەم : ئەو لایەنانەی کە ئیسلام تێیان دا لەگەلْ مارکسیزم پێك دەگاتەوە ، ئیسلامەتی لەو چاخانەدا کە بە چاکی بەڕێوە براوە توانیویەتی بیانهێنێتەدی و لە دنیای واقیع دا بیانچەسپێنێ ، بەلاّم ڕێچکەی کۆمۆنیزم هەرچەندە لە ڕواڵەت دا ئەو شتانەی کردونە

دیسان لە بیری (ئایدیالیسم)یش دا چەند خالێکی ڕاست هەن کە ئیسلام پشکی تێیان دا هەیە، وەك باوەڕ بە خوا و دیوی نەدیتراوی بوونەوەر.

بەکورتی : ئیسلام هەموو لایەنە ڕاست و تەواوەکانی (ماتریالیسم) و (ئایدیالیسم)ی تێدایە و پاك و بێ خەوشیشە لە گشت لایەنە سەلبی و هەڵە و پەڵەکانی هەردووکیان.

برایان: ئاوا دەبینین؛ نە پێناسەی ماتریالیسم بەسەر ئیسلام دا دێتە جێ و دەچەسپێ، وە نە پێناسەی ئایدیالیسم، کەواتە ئیسلام شتاق لەم دووانە نیە، بەڵکو پێویستە بڵێین: ئیسلامەتی بەرنامە و مەکتەبێکی سەربەخۆو تاقە و هەموو یاسا و دەستوورە بە کەڵك و سوود بەخشەکان دەگرێتەوە نێو خۆی و لە هەموو لەکە و ناتەواوییەکیش بەری یە و پاك و بێ گەردە.

وە ئیسلام بڕوای بە هەموو ئەو دیاردانە هەیە کە لە دنیای واقیع دا هەست بە شوێنەواریان دەکرێ یان ڕاستەوخۆ هەستیان پێ دەکرێ، جا کەیفێ خۆیەتی ئەو دیاردانە دەکەونە نێو چوارچێوەی دنیای بەرهەست و

---

دروشمی خۆی بەڵام لە ڕاستی دا تەنیا دروشمێکی بێ نێوەڕۆك و قسەی پڕۆپاگەندەیین و هیچی دیکە، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە ئەوەیە کە بیردۆزەی مارکسیزم تەنانەت لە چاخی زێڕینی دا کە گەورەترین دەسەڵات پاڵپشتی کردوە نەیتوانیوە نێوەڕۆك بە دروشمەکانی ببەخشێ .

دووەم :– ئەو شتانەی کە ئیسلام و کۆمۆنیزم تێیان دا بەشدارن مەرج نیە لە هەردووکیان دا بەیەك پێوەر بپێورێن و یەك شێوازی چارەسەر کردنیان بۆ ڕۆنرابێ.

ماددی یەوە واتە (فیزیکی)، یاخود دەکەونە نێو جوغزی جیهانی مەعنەوی و غەیبی یەوە، واتە (میتافیزیکی)[1] .

_ من ئێستاش هەر ڕای گۆڕینم هەیە.

+ کامە؟

_ ئەو ڕایەی کە دەڵێت: ئیسلام بیروباوەڕێکی میسالی یە.

+ لەبەرچی؟

_ چونکە ئینسانی ئایدیالی (مثالي) بەو کەسە دەڵێن کە شتە مەعنەوی و غەیبی یەکان وەپێش دیاردە ماددییەکان دەخات لە کاریگەری‌دا بێ گومان ئێوەش هەروا دەکەن.

+ هەرچەندە ئێوە کاتێك زاراوەی "ئایدیالیسم" بۆ ئیسلام بەکاردێنن ئەو چەمکەی لە دڵی دەگرن کە دەربارەی دواین و دەرمان خست کە ئیسلام لێی بەری یە[1]، بەڵام ئەگەر گریمان مەبەست تان لە میسالیەتی ئیسلام ئەو چەمکەی بێ کە گوتت، ئێمە دەڵێین و لەمەوپێشیش گوتمان: ئیسلام لەگەڵ هەموو لایەنە ڕاست و تەواوەکانی ڕێچکەکان دا یەك دەگرێتەوە جا ئەو لایەنە ڕاستە دەکەوێتە بەر قەڵەمڕەوی ئایدیالیسم یان ماتریالیسم.

---

(1) وشەی (میتافیزیك) یۆنانی یە و لە بنچ دا (متاتافوسیکا) بوە، واتە : ئەو دیوی سروشت ، کاتی خۆشی ئەو زاراوەیە بۆ بەشێك لە فەلسەفە بەکارهێنراوە کە دەربارەی خوا و فریشتە و جیهانی غەیبی دەدوێ ، ئەم پێناسەیەم لە کتێبی (جهانبینی) وەرگرت لاپەڕە (26)، محمد تقی مصباح .

(1) کە بریتی یە لەوەی گوایە ئیسلام باوەڕی بە جیهانی بەرهەست و دیاردە سروشتی یەکان نیە و تەنیا دان بە هەبوونی شتە مەعنەوی و غەیبی یەکان دا دێنێ.

لەوەش دا کە ئیسلام دەڵێ شتە مەعنەوی و غەیبی یەکان ماددە و ڕواڵەتەکانی دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و کاریان تێ دەکەن، چەند ڕاستی یەك هەن نابێ لێیان بێ ئاگا بین:

(1) ئەگەر مەبەست لە شتە مەعنەوی یەکان و غەیبی یەکان پەروەردگاری مەزن بێ، ئەوە شکی تێدا نیە کە لە ڕوانگەی ئێمەی بڕوادارەوە بوونەوەر و هەرچی تێدایە زادەی ئیرادە و زانیاری و توانا و بەزەیی پەروەردگارە، واتە: خوا نەك هەر کار لە ماددە و دیاردەکانی دەکات و دەیان خاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە، لەوەش وەولای کەوێ ئەگەر خوای کاربەجێ ئیرادەی نەکردبایە هەر دروست نەدەبوون و لە تاریکی نەبوون (عدم)دا بە بێ سەر و شوێنی دەمانەوە.

(2) بەڵام ئەگەر مەبەست گیان و ژیری و سیفەتە مەعنەوی یەکان بێ، دەڵێین: ئیسلام دەڵێ گیان و ژیری و سیفەتە مەعنەوییەکان ڕۆڵی سەرەکی و بنەڕەتی دەگێڕن لە ژیانی مرۆڤ دا و بە بێ وان جەستە هیچ فەرقی نیە لەگەڵ گاشەیەك دا ئەمما وێڕای ئەوەش ئیسلام دەڵی لە نێوان لایەنی مەعنەوی و ئینسان و لایەنی ماددیدا پەیوەندی و کارلێك کردنێکی دوو سەرە هەیە، واتە هەر کامێکیان کار لەوی دیکە دەکات.

_ باشە ئیسلام ڕای چیە سەبارەت بەو قسەیەی مارکسیزم کە دەڵێ هەموو دیاردە کۆمەڵایەتی یەکان لە ئایین و فەلسەفە و ئەدەب و هونەر و سیاسەت و هەتا (ژیری) یش زادەی پەرەسەندن و بەرەو پێش چوونی ماددە و ڕواڵەتەکانن، بە واتایەکی دی مارکسیزم دەڵێ: کۆمەڵگا بەرهەمی کێشەی چینایەتی یە، ئەو کێشەیەی کە هەڵقوڵاوی باروزروفی ئابورییە،

دیاره ئابووریش ڕیشه و بنجەكانی بریتین لە هۆیەكانی بەرهەم هێنان (وسائل الانتاج)، كەواتە هۆیەكانی بەرهەم هێنان دینەمۆ و وەگەڕخەری ڕەوڕەوەی مێژوو عامیلی پەرەستاندنی كۆمەڵگان[1].

+ ڕای ئیسلام لەو بارەوە ڕاست بەراوەژووی ماركسیزمە.

_ چۆن؟

+ جارێ بەری هەموو قسان ئیسلام ئەو قسەیەی ماركسیزم ؛ كە بارودۆخی ئابووری بە بنچینە و سەرچاوەی هەموو دیاردەكانی كۆمەڵگا دادەنێ، بەوڕینە و قسەی ئینسانی لەخەوێدا ترساوو گەشكە گرتوو حسێب دەكات، چونكە ماركسیزم لەسەر بنچینەی : مرۆڤ بە ئاژەڵ حسێب كردن ئەم قسەیەی كردوە، ئاشكراشە كە بیردۆزەی مرۆڤ بە ئاژەڵ سەیر كردن مۆدیلێكی كۆنی فابریقەخانەی سەدەی هەژدە و نۆزدە بوو، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە بوو كە زانیارییە ئینسانی یەكان بەر لە سەدەی بیست، وەك خەلفە نەمامێكی تازە ڕوا و خۆی دانەكوتابوو و هێز و بڕستی پەیدا

---

(1) (ئەنگلس) كە هاوڕێی زۆر نزیكی ماركس و دووەمین دامەزرێنەری ماركسیزمە دەڵێ: "بارودۆخی ئابووری و ئەو شێوە كۆمەڵگایەی كە بە شێوەیەكی حەتمی لەوییەوە پەیدا دەبێ لە هەر قۆناغێكی مێژوویی دا، بنچینەی مێژووی سیاسی و فیكری ئەو قۆناغە مێژوویی یەیە.

(ستالین)یش لە كتێبی (مەسەلەكانی لینینیسم)دا دەڵێ: "مێژووی بەرەو پێش چوونی هەر كۆمەڵگایەك بەر لە هەموو شتێك بریتییە لە گەشە كردنی بەرهەم هێنان...شێوەی بەرهەم هێنانی كۆمەڵگا بەهەر جۆرێك بێ كۆمەڵگایەكەش دیسان بە شێوەیەكی بنچینەیی هەروا دەبێت، واتە بیروڕاو بۆچوونەكانی كۆمەڵگا و گشت یاسا و دەستوور و دەزگا سیاسی یەكانی كۆمەڵگا هەروا دەبن.

بۆ نووسینی ئەم پەراوێزە سوودم لە كتێبی (پایان عمر ماركسیزم) وەرگرت: نوسراوی: ناصر مكارم شیرازی لاپەڕە (82).

نەکردبوو نەی دەتوانی سەروسیمای مرۆڤ لە ئی ئاژەڵ جویٚ وەکات، هەر لە ژێر تین تاوو فشاری ئەو واقیعەش دابوو کە مەکتەبی داروێنیسم دامەزرا، ئەمما لە دوایی دا بە تایبەتی لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەم دا کۆمەڵناسی و دەروون ناسی و توێکاری، شەقڵێکی نویٚیان بەخۆوە دی و چوونە قۆناغێکی نویٚ ترەوە. لە ئاکامی ئەمەش دا ئینسان مۆری ئاژەلایەتی لیٚ سڕرایەوە و وەك دیاردەیەکی سەربەخۆ و کەسایەتی یەکی تایبەتی حیسابی بۆ کرا، هەر لە ژێر تەوژم و تینی ئەو واقیعەش دابوو کە داروینیسم ناچار بوو لە ژێر عینوانێکی تردا و بە شێوازێکی نزیك تر لە زانیاری یەکانی سەردەم خۆی ڕانوێنیٚ و پارەی قەڵب و کەس نەویستووی جارێکی دیکەش بەڵام بە مۆرێکی دیکەوە، بێنێتەوە نێو بازاڕی ڕەشی سەودای بیردۆزە ئەفسانەیی یەکان، بەڵام بەم جۆرە داروینیی نویٚ الداروينية الجديدة" هاتە گۆڕیٚ کە (جۆلیان هکسلی) بە یەکێك لە ڕدیٚن سپی و مشوورخۆرەکانی لە قەڵەم دەدریٚ، داروێنیسمی نویٚ لە گۆشە نیگای تەسکی ئاژەڵناسی یەوە سەیری ئینسان ناکا و بە دیاردەیەکی سەربەخۆ و جویٚ لە ئاژەڵی حسێب دەکات، وە ڕای داروێن لە مرۆڤ بە ئاژەڵ دانان دا بە هەڵە دەژمێریٚ[1] .ئێستا با بێینەوە سەر مەبەستی

---

(1) جولیان هكسلي لـە كتێبێكی دا بە ناوی "man in the modren world"
واتە: (مرۆڤ لـە دنیای نویٚدا) لـە ژێر سەرباسی : ( ئینسان خاوەن كەسایەتی یەكی سەربەخۆیە )دا دەڵێت :

1- بە ڕاستی جیاوازی یەكی سەرەكی لـە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دا هەیە، بەڵام بە دەركەوتنی بیردۆزەی داروینیسم ، ژووررایەتی مرۆڤ هێدی هێدی لـیٚی داشكێنراو لـە ئاژەڵ نزیك

خرایەوە، چونکە ئەم بیردۆزەیە هیچ سنووریك لە نێوان ئینسان و ئاژەڵ دا نایەڵێ و لە ڕیزێکیان ڕادەگرێ.

2- ئەو گچکە کردنەوەی مرۆڤیش لە ئەنجامی ئەوەدا نەبوو کە خەسڵەتە ئاژەڵی یەکانی پاڵدارنە لا، بەڵکو لە ئەنجامی ئەوەدابوو کە ئینسان خەسڵەتە ئینسانی یەکانی لـێ لابراو لـێ داشکێنرا.

3- پاش بیردۆزەی داورینیسم کەرەتێکی دیکەش مرۆڤایەتی ئینسان سەرنجی توێژەرەوانی ڕاکێشا و، مەودای نێوان ئادەمی و ئاژەڵ خۆی لێك کێشایەوە، ئەمما نەی توانی بگاتە ئاستێکی ئەوتۆ بە یەکجاری خۆی لە ژێر قەڵەمڕەوی ئاژەلایەتی بدزێتەوە، بەڵکو هەربە ئاژەڵ دادەنرا ئەوەندە هەیە بە ئاژەڵێکی ئاسایی سەیر نەدەکراو بە جۆرە ئاژەڵێکی سەیروسەمەرە و بێ وێنە لەقەڵەم دەدرا.

( ئینجا دوای ئەوە دێتە سەرباسی جوێ کەرەوە بنەرەتی یەکانی ئینسان لە ئاژەڵ، وا ئێمەش بە کورتی چەند خاڵێکی لێ دەخوازینەوە لەو بارەوە ) :

1- گەورەترین جیاکەرەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ ئەوەیە کە ئینسان توانای بیر کردنەوە و دەربڕینی مەبەستی نێو دڵی خۆی هەیە، هەڵبەتە ئەمەش بنەمای ژیار و پێش کەوتنە.

2- مرۆڤ لە لایەنی گیانی یەوە سەربەخۆ و تاقە، ئەمما تا ئێستاش لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەڵ نەکراوە بۆ ناسینی مرۆڤ، چ لە بواری کۆمەڵناسی‌دا وە چ لە بواری زیندەوەرزانی (بیۆلۆجی)دا.

3- جیاکەرەوەیەکی دیکەش ئەوەیە، کە مرۆڤ هەمیشە لە بڕینی ڕێی بەرەو پێش چوون و پەرەستاندن دا لەبرەودایە، ئەم خەسڵەتەش شتێکی جەوهەری ی ئینسانە و هەبوونی فەرق و جودایی لە نێوان وی و ئاژەڵ دا دەگاتە شتێکی بەڵگە نەویست.

4- یەکی دیکە لە خەسڵەتە تایبەتی یەکانی ئینسان ئەوەیە کە دەتوانێ جڵەوی نەفسی بگرێ و هەر کاتێك ئیرادە بکات، بەسەر کەف و کوڵی غەریزەکانی دا زاڵ بێ.

5- یەکی دیکە لەو خەسڵەتانەی مرۆڤ لە گیاندارانی دیکە جوێ دەکاتەوە، توانای قسە کردنیەتی لەگەڵ غەیری خۆی‌دا و ئەنجام دانی یاری یە ڕێك و پێکەکانە، وە نەخشە کێشانی بەرنامەی پەروەردە و فێر کردن و دروست کردنی خانووبەرە و باغ و بێستان و... هتدە .

بنچینەیی باسەکەمان، گوتمان مارکسیزم لە گۆشەنیگای ئاژەڵناسی یەوە ئینسانی هەڵسەنگاندوە بێ گومان ئەنجامی ژیر بێژی یانەی ئەو هەڵسەنگاندنەش هەر ئەوەیە کە مارکسیزم پێی گەیوە، واتە: کورت هەڵێنانەوەی پێداویستی یەکانی ژیانی مرۆڤ لە: خواردن و خواردنەوە و بەرگ و پۆشاك و جینس (سێکس)دا.

هەڵبەتە کە دەشڵێین ئیسلام قسەی مارکسیزم سەبارەت بە ئابووری و ناوو تەئسیری لە ژیان دا، بە قسە بزر کاندن و وڕێنەی پیاوی گەشکە گرتوو لە قەڵەم دەدات، مانای وانیە بە چاوی گرنگی پێ نەدان و کەم بایەخی یەوە تەماشای ئابووری دەکات، نەخێر ئەمما ئەوەندە هەیە ئیسلام ئابووری لەوەی هەر گەڕێ کە بە هەموو شتێکی دانانێ، بەڵکو بە کاریگەرترینیشی دانانێ.

بەڵێ ئیسلام دەڵێ ئابووری و هۆیەکانی بەرهەم هێنانی زۆر بەتاوو تین و کاریگەرن، بەلاّم قەت ناتوانین بڵێین: باروزروفی ئابووری و هۆکانی بەرهەم هێنانی تاقە دینەمۆ و وەگەڕخەری ڕەوڕەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتین، چونکە ئەگەر بتوانین بەشێك لە چالاکی یەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵ لەسەر

---

6- جیاکەرەوەیەکی دیکەی مرۆڤ، بریتی یە لە هەبوونی هەستی لێك هەلاّواردنی چاك و خراپ و حەلاّڵ و حەرام.

7- چەندین خەسڵەتی دیکەش هەن کە تا ئێستا بە چاکی پەی یان پێ نەبراوە و دوور نیە لە داهاتوودا لە ئاکامی لێکۆڵینەوە دەروونی و کۆمەلاّیەتی یەکان دا وەبینرێن.

ئەمە ئیعتیراف و دان پێداهێنانی جولیان هکسلی یە کە زانایایەکی بێ بڕوایە، لەسەر ئاژەڵ نەبوونی ئینسان لە ترازووی زانیاری دا ، بەڵێ جۆلیان هکسلی و هەزارانی دیکەی وەك ویش ئەگەر لەرچەی زانیاری و ژیری لامل نەبن دەبێ ئاوا ئیعتیراف بکەن. بۆ نووسینی ئەم پەراوێزە سوودم لە کتێبی ) و دراسات في النفس الانسانية)ی محمد قطب وەرگرت، تەرجەمەی فارسی لاپەڕە (45، 46، 47، 48).

بنچینەیەکی ماددی و ئابووری لێك بدەینەوە، خۆ زۆربەی هەرە زۆری چالاکی یەکانی ژیان و ئەو ڕووداوو کارەساتانەی شەقڵیان بە مێژوو داوە، بە هیچ ڕێیەك نالوێ لە ڕوانگەی ئابووری و هۆی بەرهەم هێنان و بەرژەوەندی ماددی یەوە سەیریان بکرێ و، بە گەزوجاوی وان بپێورێن.

بۆ نموونە: ئایا ئەو ڕووداوە مێژوویی یەی کە گەورەترین شەقڵی لە مێژووی مرۆڤایەتی دا دروست کرد بە ئیعتیرافی زانا و شارەزایانی بێگانە[1]_ بەر لە ئی خۆماڵی  که بریتی یە لە هاتنی "محمد" پێغەمبەر و

---

(1) لە ڕاستی دا نەك هەر لە پەراوێزێك دا بگرە لە چەند کتێبێکیش دا جێ کردنەوە و حەجماندنی ئەو دان پێداهێنان و پێهەڵا گوتنانەی زانا و شارەزایانی بێگانە و خۆماڵی دەربارەی گەورەیی ئیسلام شتێکی ئەستەم و چاوەڕوان نەکراوە، ئەمما بە دەردی کوردەکە گوتی: هەر شتێك لە هیچی چاکترە و لوێچێکیش نموونەی تەغارێکەیە، منیش هەوڵ دەدەم لوێچێکی ئەو تەغارەتان بۆ بکەمە نموونە و لەبەر چاوتانی ڕانوێنم:

یەکەم: (لیۆن تۆلستۆی) ئەدیبی بەناوبانگی ڕووسیایی دەڵێ:

کێ دەیەوێ پەی بە سادەیی و بێ گرێ و قۆرتی ئیسلام بەرێ، با موتالای قورئانی مەزن بکات، بە شێوەیەکی روون و ساکار، کە هەموو مرۆڤەکان سەر بە هەر پێڕو تاقم و چینێك بن تێیان دەگەن، لەو کتێبەدا چەندەها ئایەتی پیرۆز هەن کە بە تەواوی بەڵگەن لەسەر بەرزی پایە و پلەی ئیسلام و پاکی و بێ خەوشی گیانی خاوەنەکەی (محمد) ﷺ.

دووەم: (ناپلیۆن پۆناپارت) ئیمپراتۆری ناسراوی فەرەنسایی دەڵێ: ئومێدم وایە زۆری پێ نەچێ کە ئاقڵ مەندانی جیهان خڕوە بن و بە هاوکاری وان چەند یاسا و دەستوورێك دیاری بکەین کە لەسەر بنچینەی قورئانێ دانرا بن، چونکە قورئان هەقە و بەتەنێ لە بارانی دا هەیە بەختیاری بۆ ئینسان بڕەخسێنێ.

سێیەم: (ڕنبورت) ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ دەڵێ:

پێویستە دانی پێدا بنێین کە زانیارییە سروشتی یەکان، گەردوون ناسی، فەلسەفە، بیرکاری، کە لە سەدەی دەیەم دا ئەوروپایان زیندوو کردەوە، لە قورئانێ وەرگیراون، بگرە ئەوروپا بە تەواوی مانا منەتباری ئیسلامە.

چوارەم: (وێڵــز) زانای ناسراوی ئینگلیزی دەڵێ:

ئەو تەئسیــرەی کە قورئان لە دنیایەی کردوە تا ئێستا هیچ کتێبێك نەیبوە.

پێنجەم: ( گۆتە ) شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانی دەڵێ:

ساڵەهای ساڵە کەشیشانی لە خوا بێ ئاگای ئێمە لەپەی بردن و سوود وەرگرتن لە ڕاستی یەکانی قورئانی مەزن بێ بەش بوون، بەڵام لە سۆنگەی بەرەو پێش چوونی زانیاری و لاچوونی تارمایی نەفامی و ڕەگەز پەرستی بەزوویی ئەم کتێبە سەرنجی مرۆڤایەتی بەلای خۆیدا کێش دەکات.

شەشەم: ( نۆڵد کە ) ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ دەڵێ:

قورئان بەڕێز بێژی (منطق)ی عیلمیانە و شێوازی ئیقناع کەرانەی دڵی گوێ گران بەلای خۆیدا دەکێشێ و هەمیشە بەسەر ئەو دڵانەدا زاڵ بوە کە دژایەتییان کردوە و خستوونیە ژێر ئەتسیری خۆیەوە.

حەوتەم: ( دکتۆر مارکس ) فەیلەسووفی ناسراو دەڵێ:

لە قورئانیدا چەند ئایەتێك هەن تایبەتن بە زانیاری و بیر کردنەوە و لێکۆڵینەوەوە وە بێجگە لە دان هێنان بەوەدا کە قورئان زۆر لە هەڵەکانی مرۆڤایەتی ڕاست کردۆتەوە چ چارەی دیکەم نین.

هەشـــــتەم: ( سێر تۆماس ئارنۆڵد ) مێژوونووسی ئینگلیزی نووسیویەتی:

ئیسلام تاقە ڕێی چارەسەر کردنی هەموو دەرد و دوو و نەهاتییەکانی دنیایە، ئەم ئیدیعایەش لە لایەن منەوە لاف لێدانی بێ بەڵگە نیە، بەڵکو ڕووداوەکانی ڕابوردوو ئیسپاتی ئەم قسەیەم دەکەن.

نۆیــــەم: ( بەرنادشۆ ) فەیلەسووفی ئینگلیزی دەڵێ :

بە بڕوای من ئیسلام تاقە ڕێبازێکە کە بە درێژایی سەدەکان ئامادەیی گونجان و سازانی لەگەڵ شێوە جۆراو جۆرەکانی ژیانی مرۆڤ دا هەبێ.

دەیــــەم: ( غاندی ) ڕابەری بەناوبانگی هیند دەڵێ:

کاتێك گەلە ئەوروپایی یەکان لە شەوە زەنگی نەزانی دا بێسەروشوێن بوو بوون، ئیسلام وەك ئەستێرەیەکی بەشۆق لە ئاسمانی ڕۆژهەڵات دا زەوی ڕووناك کردبۆوە و تیشکی کامەڕانی و بەختیاری بەسەر جیهانی پڕ سەروسەدادا پەخش کردبوو.

یازدەم: ( جۆرجی زەیدان ) (پێویستە بێ ئاگا نەبین لەوە کە ئەم پیاوە لە نووسینەکانیدا دەغەڵی پێوە دیارە.) مێژوونووسی مەسیحی نووسیویەتی: لەهەر جێیەك ئیسلام حوکمی کردبایە زانیاری و ئەدەب بە تاڵووکە ڕەپێش دەکەوتن.

دوازدەم: ( کۆبۆڵد ) ئافرەتی زانـــای ئینگلیز دەڵێ:

ئیسلام به تەواوی مانا ڕێبازێکی بێ نوقسانی کۆمەڵایەتی‌یە کە گشت جۆرە ئازادی‌یەکانی هێناونەدی و قەت قەت لەبەین ناچێ، چونکە لەگەڵ ژیار و بەرەو پێش چوون و زانیاری و ژیری دا هاودەنگە.

سـێزدەم: ( بەرتراند ڕاسل ) فەیلەسووف بەناوو شۆرەت دەڵێ:

لە ڕۆژگارێك دا فەلسەفە و شیعر و هونەرە جوانەکان لەچین و وڵاتە ئیسلامی یەکان دا بە چاکی چەسپی بوون، ئەوروپایی یەکان نەزانانە هەموو ئەو چەرخە بە چاخی تاریك ناودەنێن، بەڵام لە ڕاستی دا تاریکی تەنیا ئەوروپای گرتبۆوە، ڕاست تر بڵێین: تەنیا ئەوروپای مەسیحی، چونکە وڵاتی ئەسپانیا کە لە ژێر قەڵەمڕەوی موسڵمانان دابوو خاوەنی شارستانەتی و ڕۆشنبیری یەکی درەوشاوە بوو.

چواردەهەم: ( مستەر سبریل ) سەرۆکی کۆلێجی (حقوق)ی (وین) دەڵێ: مرۆڤایەتی شانازی بەو موحەممەدەوە دەکات کە لەگەڵ نەخوێندەواریشی‌دا توانی چواردە سەدە لەوەوبەر بەرنامەیەك دانێ، کە ئێمەی ئەوروپایی خۆمان بە بەختیار دەزانین ئەگەر دوای دوو هەزار ساڵ پەی بە گرنگی یەکەی بەرین.

پازدەم: ( لامارتین ) نووسەری مەزنی جیهانی دەڵێ:

موحەممەد ﷺ ئینسانێکە لە سەرووی مرۆڤەوە و لە خوار خوداوە کەواتە بێ چەند و چوون نێرراوی خودایە.

شازدەم: ( دراپیەر ) مامۆستای زانکۆی نیۆیۆرك نووسیویەتی:

زانکۆکانی موسڵمانان لێوا و لێوبوون لەو خوێندکارە ئەوروپایی یانەی کە بە نیازی زانیاری فێر بوون ڕوویان دەکردە جیهانی ئیسلام، نەك هەر خوێندکاران بگرە پاشا و گەورە گەورەکانی ئەوروپاییش بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی‌یەکانیان بەرەو وڵاتی موسڵمانان ملیان لێ دەنا.

حەڤدەم: ( بوگولد ) زانای ناسراوی ئینگلیز نووسیویەتی: زانکۆکانی بەغدا و ئەندەلووس بەخێر هاتنی خوێندکارە بیانی یەکانیکان دەکرد لە جوولەکە و دیان و مەسرەف خوێندنیان دەکێشان و ڕێزیان لێ دەگرتن.

هەژدەم: دکتۆر( ماکس میرهۆف ) زانای بەناوبانگ دەڵێ:

لە شەڕی خاچ پەرستەکان دا موسڵمانەکان بە پزیشکە ئەوروپاییەکان پێ دەکەنین، چونکە شـارەزایی یەکی زۆر سادە و سـەرەتایی یان هەبوو، بەڵام لە دوایی دا کتێبەکانی (ابن سینا) و (جابر) و (رازی) و (حسن بن هیثم) یان وەرگێڕایە سەر زمانی لاتینی و بەم جۆرە زانیاریی موسڵمانان وەك باران بەسەر خاکی وشك و برینگی ئەوروپادا باری.

نۆزدەم: ( کریستف کۆلۆمب ) دۆزەرەوەی ئەمریکا دەڵێ:

من یەکەم جار مەبەستی بەرزی خۆمم  کە دیتنەوەی ڕێی هیندستان بوو  لە کتێبی (ابن رشد الاندلسی) زانای بەناوبانگی ئیسلامی وەرگرت، ئینجا لە دوایی‌دا لەو ڕێیەوە توانیم ئەمریکا وەبینم.

بیستەم: ( همیلت ) زانای گەورەی ئەورپایی دەڵێ:

پێویستە مسوڵمانەکان بە بناغە داڕێژی ڕاستەقینەی زانیاری یە سروشتی یەکان دانێین.

بیست و یەکەم: ( دیکارت ) فەیلەسووف ناسراو دەڵێ:

(ژووبەر)ی فەڕەنسایی لە ئەندەلووس لە کن موسڵمانەکان فێرە زانیاری بوو.

بیست و دووەم: ( پرۆفیسۆر هاکنج ) زانای ئەمریکایی دەڵێ:

ڕێی بەرەو پێش چوونی ولاتە ئیسلامی یەکان ئەوە نیە کە بکەونە شوێن ڕژێمە ڕۆژئاوایی یەکان، وە دەردی ولاتە ئیسلامی‌یەکان ئەوە نیە کە لە ئیسلام دا ئامرازەکانی پێش کەوتن نین، بەڵکو دەردی وان نەبوونی مەیل و ئیرادەی پێویستە بۆ سوود وەرگرتن لەو ئامرازانە.

بیست و سێیەم: دکتۆر ( مایکل هارس ) خاوەنی کتێبی "سەد یەکەمەکان "المآة الاوائل" ، لەو کتێبەدا هەستاوە بە گوڵبژێر کردنی مێژووی مرۆڤایەتی و (100) پیاوی هەڵبژاردوە، کە بە بڕوای وی کاریگەرترین ئینسان بوون لە مێژوودا بەلام لەگەڵ ئەوەش دا نووسەر مەسیحی‌یە، پێغەمبەری پێشەوامانی لە پێش هەموانەوە داناوە.

بیست و چوارەم: دکتۆر ( عەلی شەریعەتی ) شەهید دەڵێ: ئەوروپایی‌یەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست دا مۆری )الله( یان لە بەرهەمە پیشەسازی یەکانیان دەدا  کە مۆری جیهانی ئیسلامی بوو  بۆ خاتری وەی ڕەمێنی هەبێ و بە دەسکردی موسڵمانانی بزانن و چاکی لێ بخەفتین.

خوێنەرانی بەڕێزم:

ئەمانە نەختێك بوون لە گەلێك و چەند دەنكێك بوون لە ( لەگەنێك ) لە دان پێداهێنان و پێهەلا گوتنی زانا و شارەزایانی جیهان سەبارەت بە گەورەیی و بالا دەستی ئیسلام.

ئەمـا تێبینی یەك هەیە نالوێ لـێی بێ خەبەر بیـن :

ئێمە کە ئیعتراف پێ کردنی ئەوان زانایانمان لێرەدا باسکرد دەربارەی ئیسلام، مەبەستمان ئەوە نیە کە دان پێدا هێنانی ئەو زانایانە بکەینە بەلگەی گەورەیی و تێروتەواوی و بێ گەردی ئیسلام، نەع چونکە ئیسلام وەك ڕۆژی ڕووناکە و حەوجێی ئیعتیراف پێ کردنی کەس نیە، بەلام تاقە مەبەستمان لێرەدا ئەوە بوو کە گومانێك بڕەوێنینەوە لەسەر دڵ و مێشکی ئەو کەسانەی پێیان وایە ئیسلام لەگەڵ زانیاری‌دا دانووی ناکوڵێ و، وا دەزانن ئینسان تا زانیارتر و شارەزاتر بێ پێویستە پتر لە ئیسلام دوور بکەوێتەوە سەر لەبەری ئەم دان پێداهێنانانەشم لە

ﷺ بلاو بوونەوەی ئیسلام و دامەزراندنی گەورەترین و دادگەرترین دەوڵەتی سەر زەوی، کە توانی زیاتر لە (13) سەدە خۆی ڕاگرێ[1] ، چۆن چۆنی دەگونجێ لە ڕوانگەی مارکسیزمەوە  کە هەموو شتێك بە گەزی ئابووری دەپێوێ  تەفسیری بکرێ ؟!!

ئاخر کێ هەیە بتوانێ لام و جیمی لەوەدا بکات کە بەر لە هاتنی ئیسلام ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەوە پاش دەوڵەتی ئیسلامی یان تێدا دامەزراوە کە زۆربەی ئاسیا و ئەفریقا وبەشێك لە ئەورووپا دەگرێتەوە[1] هیچ جۆرە گۆڕانێك بەسەر بارودۆخی ئابووری یان دا نەهاتبوو، واتە گۆڕانی بارودۆخی ئابووری نەبوو بەهۆی گۆڕینی : سیاسەت و ئایین و ئەدەب و هونەر و ..هتدی ئەو کۆمەڵگایانە، بەڵکو بە بەراوەژووەوە هەموو ئەو کۆمەڵگایانە بەرنامەی خودایان پێ گەیشت و لە ئەنجامی جێگیر بوون و چەسپانی بیروبڕوای ئیسلامی لە دڵ و دەروونیان دا ، سەرلەبەری ژیانیان گۆڕا، وە لە ڕاستی دا گۆڕانکاری لە بواری ئابووریدا هۆیەکەی ئەو گۆڕانکاری یە فیکری و عەقیدەیی یە بوو کە بەسەر خەڵکەکەدا هات نەك بە پێچەوانەوە، وەك بیردۆزەی مارکسیزم گومان دەبات.

ئەمە و دەیان و سەدان نموونەی دیکە هەن، کە زۆر بە ڕوونی بۆچوونی بیردۆزەی مارکسیزم سەبارەت بە ئابووری و گۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵگا، وە درۆ دەخەنەوە.

---

کتێبی "اعترافات دانشندان بزرگ جهان" وەرگرت نوسراوی : خیرالله مردانی، بێجگە لە (23، 24).

(1) بێ گومان لە پاش سەردەمی جێ نشینایەتی چوار خەلیفەکان ، دەوڵەتی ئیسلامی برێك لایەنی خرابی تێدا پەیدا بوون و دووچاری هەندێك نەخۆشی بوو.

(1) ئەو دەمی ئەمریکا نەدیترابۆوە، چونکە (کریستف کۆلۆمب) لە ساڵی 1492ز دا پاش گەشتێکی چەند مانگەی دەریایی دۆزیەوە، اطلاعاتی عمومی لاپەڕە (665).

سەبارەت بە کاریگەرایەتی هۆیەکانی بەرهەم هێنانیش، ئیسلام لەو بارەوە بیروڕای سەربەخۆی هەیە و مارکسیزمیش بە هەڵتـریزاوو ساتمە بردوو لە قەڵەم دەدات.

_ بۆ ئیسلام لەو بارەوە چ دەڵێت ؟!

+ بۆ ئەوەی لەو بارەوە ڕای ئیسلامت بۆ ڕوون بکەمەوە، وای بە پەسند دەزانم لەسەر شێوەی پرسیار و وەڵام، مەسەلەکە بتوێژینەوە، ئێستا من پرسیارت لێ دەکەم و تۆش وەڵامم بدەوە لە ڕوانگەی مارکسیزمەوە، دەبا لە نووکەوە تێڕاچین:

باشە کاك (—) کۆمەڵگا لە ئەنجامی چی‌یەوە گۆڕانی بەسەر دادێ و پەرە دەستێنێ ؟!

_ لە ئەنجامی دژایەتی نێوان هێزی بەرهەم هێنان و جۆری خاوەنایەتی بەسەر هۆیەکانی بەرهەم هێنان دا، بە تەعبیرێکی ساکارتر: دژایەتی چینەکان.

+ واتە: ئێوە دەڵێن هۆیەکانی بەرهەم هێنان (وسائل الانتاج) دەچنە دەستی تاقمێکەوە و لە سۆنگەی ئەوەشەوە ئەو تاقمە کە هۆیەکانی بەرهەم هێنانی کەوتۆتە چەنگ زۆربەی گەل دەچەوسێتەوە، ئینجا لە ئەنجامی ئەوەش دا جەنگ و دژایەتی لە نێوان تاقمە کەمە چەوسێنەرەکە و گەلە ستەم لێکراوەکەدا بەرپا دەبێ.

_ بەڵـێ

+ باشە ئێوە ناڵێن چۆن هۆیەکانی بەرهەم هێنان کەوتنە دەستی تاقمە کەمەکەوە و خەڵکەکەی دیکە لـێیان بێ بەش بوو؟

_ لە ئەنجامی ئەوەوە کە تاقمە کەمەکە ⃞ کە بریتین لە کۆیلەدار لە قۆناغی کۆیلایەتی دا و، ئاغا و دەرەبەگ لە قۆناغی دەرەبەگایەتی (فیودالیسم) داو، سەرمایەدار لە قۆناغی سەرمایەداری (کاپیتالیسم)دا ⃞ موڵك و

سامانیان لە چەنگ دایە و باقی خەڵکەکەش دەستی بەتاڵە و ڕووت و ڕەجاڵە.

+ بەڵام برا گیان مەسەلەکە هەر بەوەندە کۆتایی پێ نایە و کورد گوتەنی: قەرە قەپی لێ ناکرێ و، زۆر لەوەی قووڵ ترە کە ئێوە بیرتان لێ کردۆتەوە.

_ چۆن ؟!!

+ چونکە ئێوە پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارەش بدەنەوە.

لە ســـۆنگەی چی یەوە موڵك و دارایی کەوتە چەنگ تاقمە کەمەکە و زۆربەی خەڵکەکەش دەم لە پووش و بێ پشك و بەش کەوتنە گۆڕێ؟ ئایا ئەو تاقمە کەمە بە میرات لە بابیانەوە بۆیان مابۆوە؟ ئەدی بابیان لە کوێ هێنابوو وە هەروەها...

_ (—) سەرسامی و مات بوون.

+ ئەلێرەدا و لە هەرجێیەکی دیکەش دا، کاتێك بیردۆزە و ڕێچکە پووچە دەستکردەکان مات و حەیران دەبن و سەریان وەبەردی ئەلحەدێ دەکەوێ و زاریان دەبێتە تەڵەی تەقیو، ئیسلامی مەزن و تێرو تەواو و بێ خەوش، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە شێوەیەکی واقیع بینانە دەڕوانێتە بوونەوەر و ژیان و مرۆڤــ، واتە بە بێ لێ کەچ کردن و لێ زیاد کردن، بە واتایەکی دی ئیسلام لەبەرئەوەی بڕوای بە بوون (وجود) هەیە، بە بەرهەست و نابەرهەستی‌یەوە، لە لێکدانەوەی هیچ جۆرە دیاردەیەکی سروشتی و کۆمەڵایەتی دا دانامێنێ و دەستەوستان نابێ، بەڵێ لێرەدا کە مارکسیزم داری لە شاقەلێ دراوە و حەشتەبای پێ نەماوە و دۆش داماوە، ئیسلام وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: بە دان هێنان بە لایەنی مەعنەوی و هەست پێ نەکراوی ئینسان دا وەڵامی ئەو پرسیارە دەدرێتەوە ، ئاوا.

تاقمە کەمەکە بەهۆی دوو عامیلانەوە توانیویانە دەست بەسەر موڵك و دارایی دا بگرن و دواییش بەهۆی ئەو موڵك و دارایی یەوە دەست بەسەر هۆیەکانی بەرهەم هێنان دا بگرن:

یەکەم: ئەو تاقمە کەمە لە زۆربەی خەڵکەکە ژیرتر و زۆرزان تر بوون.

دووەم: لە زۆربەی خەڵکەکە ئازاتر و بە دەسەڵات تر بوون.

هەڵبەتە هەر کام لە ژیری و ئازایەتیش دوو خەسڵەتی مەعنەوین و فریان بە سەر ماددەوە نیە، کەواتە: گۆڕانکاری و پەرەسەندنی کۆمەڵگا لە ئاکام دا هەر دەگەڕێتەوە سەر بنج و بناوانێکی مەعنەوی و نادیار، یان ڕوون تر بڵێین: غەیبی و میتافیزیکی[1] .

---

(1) لێرەدا دەروێش و مریدانی مارکسیزم چیان پێ نامێنێ، بەلام ئایا بێ دەنگ دەبن و دان بە هەق و ڕاستی دا دێنن ! هەڵبەتە نەء چونکە شتی وا لەوان ناوەشێتەوە، دەبا بزانین چ پینە و پەڕۆیەك ساز دەکەن بۆ گرتنی ئەو کەلێنە زلەی بیردۆزەکەیان، دەگونجێ بڵێن:

نەخێر سەرچاوەی هەر کام لە ژیری و ئازایەتی ماددەیە، چونکە کابرای ئازا بۆیە ئازایە بەخۆوەتر و قەبەترە و بەتین و تاقەت ترە، ئەمما واقیع ئەو قسەیە ڕەت دەکاتەوە، چونکە زۆر وابووە بابای قەڵەوو قەبە و فیل ئاسا لە دەستی مرۆڤێکی ڕیوەڵە و نابووت و بێ داروباردا زەبوون و پەك کەوتە بووە.

هەروەها دەگونجێ بڵێن: بیروهۆش دیاردەیەکی ماددی زۆر هاڵۆز و پڕ وردەکاری یە کە مێشك دروستی دەکات، هەروەك چۆن جەرگ زراو دروست دەکات !!

بەلام ئیشەکەیان بەوەی تێکچووە کە لەم قسەیەش دا وەك زۆربەی قسەکانیان هەر بە تەنێن و، گشت زانا و شارەزایان خڕ لەسەر ئەوەن کە ژیری و بیرکردنەوە دیاردەیەکی ناماددی یە، چونکە هیچ کام لە خەسڵەتەکانی ماددەی تێدا نەهاتوونەدی، لە ڕەنگ و دەنگ و بۆن و تام و چڕی و کێش و قەبارە، بەڵێ کورد گوتەنی: بەری ڕۆژێ بە بێژینگێ ناگیرێ، مەیدانی درۆیەش کورتە و چی بە بەرەوە نیە.

ئەو نموونەیەش کە دەی هێننەوە بۆ سەلماندنی دەعواکەیان  واتە وێچواندنی مێشك و ژیری بە جەرگ و زراو  بە چ مەزەبان لەگەڵ ژیری و زانیاری دا هەڵناکات، چونکە جەرگ لە چەند خانەیەك پێك هاتوە و زراویش هەروا، ئەمما مێشك شتێکی ماددی و بەرهەستە و وەك

_ — (بێ دەنگی).

+ ها ئێســتا چ دەڵێی ؟!

_ بەهەر حاڵ، لایەنە مەعنەوییەکان کار لە ماددە بکەن یان بە پێچەوانەوە قسەکەی من وەدرۆ ناکەوێتەوە و هەر بە ڕاستی دەزانم و ئێستاش هەر لە سەر ڕای خۆمم و دەڵێم: لە دنیادا دوو جۆرە بیروباوەڕ هەن ماتریالیسم و ئایدیالیسم [1] .

---

جەرگ لە چەند خانەیەك دروست بوە، بەڵام ژێری دیاردەیەکی مەعنەوی یە لە خانان پێك نەهاتوە، کێش بەم قسانە پۆز و نەقایل دەبێ ئەوە عەرز و ئەوە گەز با بەڵگەمان بداتە دەست تاکو بڵێین ڕاست دەفەرمووی !

(1) دۆستە سەنگین و بەڕێزەکان:

لێرەدا دوایی مان بە وتووێژەکەمان هێنا، جا هەرچەندە لە ڕواڵەت و لەبەردەم تەماشا کردنێکی سەرپێیی دا دەبینرێ، کە ئیسلام هەرچەندە نەکەوتۆتە بارێ بنەوە ئەمما سەریش نەکەوتوە، بەڵام بۆ سەرنج دەرێکی ژیر و وردبین دەردەکەوێ کە ئیسلام لەم دەبەرێك ڕاچوونەدا مەزن ترین سەرکەوتنی دەسگیر بووە، چونکە گرنگ ئەوەیە بابای دوێنراو قەڵۆش بێ و هەگبەی بیردۆزەی بەتاڵ بێ، ئیدی دانی پێدادێنێ یان نا گرنگ نیە، چونکە بابای وەبنەوە کەوتوو بەوە کە نای سەلمێنێ وەعەرزێ کەوتوە ناچێتەوە باری سەرێ، بە هەڵوێستی ئەو هاوڕێ مارکسیستەش بەسەرهاتێکم هاتەوە یاد حەز دەکەم بۆتان بگێڕمەوە، ئەوجار لێتان جوێ وەبم، تاکو لە ئالقەی سێیەمی ئەم زنجیرەیەدا پێتان دەگەمەوە:

دەگێڕنەوە جارێکی دوو برادەر وێکڕا دەڕۆیشتن، لە دووررا تارماییەکیان دێتە بەرچاوان، یەکێکیان دەڵێ: ئەوە داڵاشە، ئەوی دیکەشیان دەڵێ ئەمن بە بزنی تێ دەگەم، تاو بۆ تاوێ هەتا وەنزیکتر دەکەون پتر داڵاشایەتی تارمایی گۆڕین بەسەر بزنایەتیەی دا زاڵ دەبێ، بەڵام ئەوەیان کە هەوەڵ جارێ بە بزنی تێ گەیوە، لە قسەی خۆی نایەتە خوارێ، کاتێك کە زیاتر نزیك دبنەوە، داڵاشەکە لە شەققەی باڵان دەدا و دەفڕێ ، برادەرەکەی پێی دەڵێ:

بێ قەزا بی یاخوا بۆ هێندە کەڵلە ڕەق و نەسەلمێنی خۆ ئەمجار قسەت نەما !!

کابرای نەسەلمێن و کەڵلە وشکیش هەر نای کاتە نامەردی و دەڵێت:

وەڵڵاهی هەزار کەڕەتی دیکەش بفڕێ هەر دەڵێم بزنە.

# بەرکوڵێك دەربارەی پووچاندنەوەی ماتریالیزمی مێژوویی

خوێنەرانی خۆشەویستم، بیردۆزەی مارکسیزم گەلێك لایەنی پووچ و لەگەڵ ژیری نەگونجاوی تێدان، بەڵام ئەوەی  به بڕوای من  لە هەمووی پووچ تر و ناقوڵاترە مەسەلەی تەفسیر کردنی مێژووی مرۆڤایەتی یە لەسەر بنچینەی ئابووری و هۆیەکانی بەرهەم هێنان، واتە ماتریالیزمی مێژوویی (المادة التأريخية) ، لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی بڕێکی دیکەش نشتەری ژیری لە دومەڵی پڕ لە ئەفسانەی مارکسیزم وەکارخەین و ئاوەڵای بکەینەوە، بەڵام پێشەکی با گوێ بۆ ڕدێن سپی و قسە ڕۆیشتووانی کۆمۆنیزم بگرین، بزانین لەو بارەوە چ دەڵێن :

(1)مارکس لە کتێبی (مساهمة في نقد الاقتصاد السياسي)دا، دەڵێت:

"ئەوەی کە شێوەی ژیانی ئینسان دروست دەکات، ژیری و بیر کردنەوەی وی نیە، بەڵکو شێوەی ژیان و بارودۆخی ژیانە کە ژیری و بیرۆهۆش بۆ مرۆ دەڕەخسێنیّ.."

---

هەڵبەتە بە نەسەلماندنی ئەو برادەرە مارکسی یەش نە مارکسیزم و کۆمۆنیزم وەڕاست دەگەڕێ و نە ئیسلامی ئازیز و بێ لەکەش دەبێتە ئایدیالیسم.

**(2)ئەنگلز لە کتێبی (فورباخ و نهاية الفلسفة الالمانية)دا، دەڵێت: "فكر ماددەی نەهێناوەتە دی، بەڵكو ماددەیە كە بیروهۆشی بەرهەم هێناوە".**

**(3)ستالین لە کتێبی (المادية الجدلية)دا، دەڵێت: "جیهان بەهۆی یاساكانی ماددە لە گەڕدایە و پەرە دەستێنێ و، حەوجێی سەرپەرشتی كەرێكی گشتی نیە".**

**بەڵێ ئەمەیە ڕای ڕابەر و ڕدێن سپیانی ماركسیزم سەبارەت بە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی ، وەك دەبینین؛ ماركسیزم دەڵێت:**

تاقە هێزێك كە ڕەوڕەوەی مێژووی وەگەڕ خستوە و دەی ئاژوێ بریتیییە لە بارودۆخی ئابووری، واتە: نە بیـر و ئاوەزی زانـــا و شـــارەزایان وە نە ئازایەتی و زەبر بە دەستی ی پاڵەوانان، وە نە ویسـت و ئیرادەی گەلان، وە نە هەست و نەستە دەروونی یەكان وەك : عشق و خۆشـــەویستی و بوغـــزاندن و حەسوودی و .... هتد، وە نە بارودۆخی جوگرافیایی، هیچ جۆرە تەئسیرێكیان لە دروست كردنی مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی دا نیە !!

بەڵام وەرن با وێكرا ئەم جۆرە بۆچوون و ئەم تەزرە بیرە، بە ترازووی ژیری بكێشین، تا بزانین چۆن دەردەچێ !

یەكەم: ئامرازو هۆیەكانی بەرهەم هێنان  كە ئابووری یان لەسەر بەندە  بەرهەم و زادەی ویست و ئاوەزی ئینسانن و ئینسان ڕەخساندوونی. كەواتە ئینسان بنچینە و ئەسڵە و ئەوان بەرهەم و لق و پۆپی وین، مادام وابێ ئەگەر بمانەوێ تەفسیری ژیانی مرۆڤ بكەین پێویستە یەكەم جار خودی مرۆڤ بتوێژینەوە، نەك بارودۆخی ئابووری یان هۆیەكانی بەرهەم هێنان كە زادە و شوێنەواری ئینسانن، چونكە تاكو سەرچاوە نەناسرێ، ناگونجێ ئەو

جۆگەیە بناسرێ کە لێیەوە هەڵبەستراوە. مادام وابێ شوێن کەوتووانی مارکسیزم لە مەسەلەی تەفسیر کردنی مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی دا بەهەڵەدا چوون و هەڵتریزاون و وەك ئەو کابرایەیان لێ هاتوە، کە دەڵێن لە تاڵ تاڵووکەیی و شپرزەیی یان لەباتی وەی ئەسپەکەی لە لای پێشەوەڕا لغاو کات لێکدا لێکدا لغاوەکەی لە لای پاشەوەی ئەسپەکەی دەکوتا، ئەمما چ فایدەی نەبوو، بێجگە لە ماندوو بوونێ چیدی پێ نەبڕا !!

دووەم: ئامراز و هۆیەکانی بەرهەم هێنان وێڕای ئەوەی کە گوتمان زادە و بەرهەمی ئینسانن و شوێنەواری تێدا درەوشانەوەی ویست و ژیری ئینسانن، ئەوان هیچ چەشنە ویست و ئیرادەیەك شك نابەن تاکو بگونجێ وەگەڕ خستنی ڕەوڕەوەی مێژوویان وەپاڵ دەین، بەڵێ بە ڕاستی بیردۆزەی کۆمۆنیزم کە وەگەڕ خستن و گۆڕنکاری ژیانی مرۆڤ پاڵ دەداتە لای هۆیەکانی بەرهەم هێنان و بە هیچ ڕەنگێك ئیرادە و ویستی مرۆڤ ناهێنێتە نێو حیسابانەوە، شوێن کەوتووانی خۆی دەباتەوە تافی گڕو گاڵ و دادە و بابە کردن، چونکە:

1- ئەگەر ئینسان نەبا و ئیرادەی ئینسان نەبایە، ئامراز و هۆیەکانی بەرهەم هێنان ناویان لە کوولەکەی تەڕیش دا نەدەبوو.

2- ئەگەر ئینسان دروست کەر و ڕەکارخەری هۆیەکانی بەرهەم هێنان بێ، بۆ دەبێ مارکسیزم هەر موچیڕ بێ لەسەر ئەوەی کە ئینسان هیچ دەورێکی لە گەڕان و سووڕانی چەرخی مێژوو دانیە ؟!!!

سێیەم: دەروون ناسیی هاوچەرخ ، ئەو فەلسەفە و بۆچوونەی پووچ کردۆتەوە کە وەك شتێکی یەك لایەنە دەی ڕوانیە مرۆڤ و، دەڵێت:

مرۆڤ تەنیا پاڵنەرێك و دووان كاری تێ ناكەن لە ژیانی داو، دەكەوێتە بەر قەڵەمڕەوو ژێر تاوو تینی چەندین پاڵنەری جۆراو جۆرەوە، وەك : شەیدایی ی بۆ خواناسی و ئازادی و سەربەخۆیی و دادگەری و بەرەو تەواویەتی چوون (تكامل) و چاكە كردن و ڕەوشت بەرزی و دارایی كۆكردنەوە و زانیاری وەدەست هێنان.

بەڵێ هەر كام لەم پاڵنەرانە كاردەكاتە سەر مرۆڤ و بەرەو ئامانجێكی دیاری كراو پاڵی پێوە دەنێ، كەواتە هیچ ماقووڵ نیە لە نێو ئەو هەموو پاڵنەرانەدا گرنە لە یەكێكیان دابگری و ئەوانی دیكە فەرامۆش بكەی، بەڵكو هەڵوێستی ژیرانە ئەوەیە كە بڵێین: هەر كام لەم پاڵنەرانە كار دەكاتە سەر ژیانی ئینسانو چالاكی یەكانی، جا هەیانە كەم و هەیانە زۆر.

بە ڕاستی سادەیی و نەفامی یە، ئایین و ئەوین و ڕەوشت و خووی بەرز بە زادە و بەرهەمی هۆكانی بەرهەم هێنان و بارودۆخی ئابووری لە قەڵەم بدرێن ، لە كاتێك دا دەبینین؛ زۆربەی زۆری خەڵكی هەموو بەرژەوەندییە ئابووری و ماددییەكانیان لە پێناوی وان دا بەخت دەكەن. ئایا ئەم هەڵوێستە ئەوەی لێ نافامرێتەوە كە ئەو شتانە نەك هەر وێرای ئابووری كاریگەرن لە ژیانی مرۆڤ دا. بەڵكو كاریگەر تریشن و ئابووری و بابی ئابووریش دەخەنە ژێر ڕكێفی خۆیانەوە ؟!!

چوارەم: ئەگەر بێت و ڕووداوەكانی مێژوو بێنینە پێشەوە لە ڕوانگەی ماتریالیزمی مێژوویی یەوە سەیریان بكەین و بمانەوێ لەسەر بنچینەی ئابووری و هۆكانی بەرهەم هێنان تەفسیریان بكەین، دووچاری گەلێك پرسیاری بێ وەڵام دەبین، بۆ وێنە با یەكێك لە دیاردە مێژوویی یەكان بكەینە جێی سەرنج و تێوەڕامان، كە بریتی یە لە جەنگ.

ئایا بۆمان دەچێتە سەرێ هەموو جەنگەکانی مێژوو بە سەنگ و ترازووی ئابووری هەڵسەنگێنین؟!! بێ گومان نەء، چونکە چەند جۆرە پاڵنەر (دافع) لە سروشتی ئینسان دا هەن، هێندە جۆرە جەنگیش لە مێژوودا هەن، هیچ کەسێك ناتوانێ لاملی لەوەی بکا، کە ژمارەیەك لە جەنگەکان بە پاڵنەرێکی ئایینی بەرپا بوون و هیچ چەشنە پاڵنەرێکی ئابووری و ماددی لە گۆڕێ دا نەبوە، وە گومانی تێدا نیە کە ژمارەیەکی زۆر لە جەنگەکان بە مەبەستی وەدەست هێنانی ئازادی هاتوونە دی، تەنانەت جاری وابوە حاڵەتێکی دەروونی و عاتیفی وەك: عیشقی نێوان **پیاوو ئافرەتێك، یان هەڵچوون و تووڕە بوونێك، یان خۆسەپاندن و خۆ ڕانانێك، بۆتە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگێکی مەزن.**

**هەڵبەتە ئێمە لاملی لەوە ناکەین کە ئابووریش وەك عامیلێك ڕۆڵی خۆی گێڕاوە، بەڵام وەك یەك عامیل نەك تاقە عامیل !**

**پێنجەم:** مارکسیستەکان کە دەڵێن: دژایەتی چینەکان دینەمۆی گۆڕان و **پەرەسەندنی کۆمەڵگایە، پرسیارێکی گرچوو تەزێن بەرۆکیان دەگرێ:**

**باشە ئێوە خۆ بۆ خۆتان دەڵێن کۆمەڵگای کۆمۆنی یەکەم چینایەتی تێدا نەبووە، مادام وابێ دینەمۆ و بزوێنەری گۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵگا لەوێدا نەبووە، ئەدی پێم ناڵێن لە سۆنگەی چیەوە کۆمەڵگای کۆمۆنی سەرەتا گۆڕاو پەرەی سەند و لە جێی ویدا کۆمەڵگای کۆیلەدار و کۆیلان ڕەخساو پنجی گرت؟!**

**شەشەم: دیسان بۆمان هەیە ئەم پرسیارەش ئاراستەی شوێن کەوتوانی کۆمۆنیزم بکەین:**

**ئێوە دەڵێن: گۆڕان و پەرەستاندنی کۆمەڵگاکان بە پێکهاتنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی کۆتایی (المجتمع الشيوعي النهائي) ڕادەوەستێ و کۆتایی پێ دێ، چونکە دیاردەی چینایەتی تێ دەچێ و هەموو خەڵك بە یەکسانی و وەك یەك دەژین، هەڵبەتە کە دیاردەی چینایەتیش تێ چوو و نەما، هەر لەو دەمیش دا دینەمۆ و بزوێنەری مێژووش تێ چووە، باشە ئێستا دەپرسین:**

**ئەدی ئێوە نەتان گوت: جووڵان و پەرەستاندن دیاردەیەکی تایبەتی و هەمیشەیی ماددەیە  هەڵبەتە ئەوان کۆمەڵگا بە دیاردەیەکی ماددی ڕووت دەزانن  دە کوانێ گۆڕان و پەرەستاندنی ماددە ؟!!**

بۆ دەبێ لە دوای پێکهاتنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی گۆڕان و پەرەستاندن ڕاوەستێ و جینگڵی لێ ببڕێ ؟!!

بۆ ڕزگار بوون لە چەنگ ئەم پرسیارە دوو وەڵام هەن:

**یەکەم:** کە بڵێین درۆیە ماددە جووڵان و گۆڕان و پەرەستاندنی نیە، دیارە ئەم وەڵامەش شتێکی نا ڕاست و نەگونجاوە لەگەڵ زانیاری و ژیری و واقیعی ماددەدا.

**دووەم:** کە بڵێین : ئەو بیردۆزەیەی لە ئاکام دا بزووتن و پەرەستاندنی ماددەی تێدا ڕادەوەستێ غەڵەت و پەڵەت و ناتەواوە، بێ گومان هەر ئەم وەڵامەش ماقووڵ و گونجاوە.

حەوتەم: هەندێك لە ئالقە لە گوێیانی مارکسیزم دەیانەوێ بیردۆزەکەیان لەو ئاکامە سەخت و دژوار و پڕ مەترسییە قوتار کەن، کە پرسیاری شەشەم خستیە بەر چاویان، بۆو مەبەستەش هانایان وەبەر وەڵامێکی وا بردوە کە زۆر لەو کابرایەیان خراپتر لێ هاتووە، کە دەڵێن: خراپەیەکی کردبو، بەڵام

کاتێك لێ ی ئاشکرا بوو ویستی عوزر و بیانوێکی بێنێتەوە، کەچی عوزرەکەی زۆر لە تاوانەکەی بەدتر بوو، لەوەوە ئەو قسەیە داکەوت کە دەڵێت: عوزر لە قەباحەتێ خراپتر.

بەڵێ ئاوا وەڵامی پرسیاری شەشەم دەدەنەوە:

پاش هاتنە دی کۆمەڵگای کۆمۆنیزمیی، دژایەتی لە نێوان چینەکان دا نامێنێ چونکە، کۆمەڵگا تێکڕا دەبێتە یەك چینی یەکسان، بەڵام ئەو جار دژایەتی (تضاد) دەکەوێتە نێوان ئینسان و سروشتەوە !!

بەڵام لە ڕاستی دا ئەم وەڵامە پتر ساویلکەیی یەتی و (سەفسەتە)ی کۆمۆنیستەکان دەسەلمێنێ، چونکە :

**1) ئەوان لە بنچینەکانی دیالکتیك دا دەڵێن: دژایەتی (تضاد) بەوە دەڵێن کە لە نێو یەك شت دا دوو لایەنی دژ بە یەك هەبن، واتە : پێویستە بابەت (موضوع) ی دژایەتی یەکە یەك شت بێ، نەك دوو شت، هەڵبەتە هەر کام لە کۆمەڵگا و سروشت یەك زاتی سەربەخۆیە و پێویستە دەنێو هەر کامێکیان دا دژایەتی هەبێ، نەك بە هەردووکیان دژایەتی پێك بێنن، کەواتە کە مارکسیستەکان کۆمەڵگا و سروشت هەردوکیان بەیەك زات دادەنێن و ئینجا دژایەتی نێوانیــان بە دژایەتی یەکی ڕاستەقینە لە قەڵەم دەدەن، ئەوە لە یاساکانی مام دیالکتیکیان لاداوە و وەك ئەو منداڵەیان کردوە کە لە دەمی قەڵس بوونیدا، دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکات.**

**2) دژایەتی (تضاد) لە نێوان دوو لایەن دا، لەیەك کات و شوێن دا، کاتێك پێی دەگوترێ دژایەتی، کە یەکێك لەو دوو لایەنانە ببێتە هۆی تێ چواندن و لەنێو بردنی ئەوی دیکەیان، بەڵام خۆ هیچ کام لە**

کۆمەڵگا و سروشت هۆ نیە بۆ لە نێو بردنی هاوەڵەکەی،وە چ جەنگ و دژایەتیشیان لە نێوان دا نیە، بەڵکو ئەوەی کە دەبینرێ بێجگە لە پێکەوە گونجان و تەبایی و لە بابی هیچی دیکەی نیە، ئەوپەڕی جەنگ و ناکۆکی کە لە نێوان کۆمەڵگا و سروشت دا بەدی بکرێ، بریتی یە لە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ زیاتر ناسین و شارەزایی پەیدا کردن سەبارەت بە سروشت، بۆ وەی پتر بتوانێ لە نیعمەت و بەخششەکانی بەهرەمەند بێ، بەمەش چ دژایەتی پەیدا نابن، چونکە هیچ کام لە کۆمەڵگا و سروشت نابنە هۆی تێ چوون و نەمانی ئەوی دیکە.

3) ئەو جۆرە دژایەتی یە - ئەگەر بگونجێ پێی بلێین دژایەتی - ڕۆژی لە دایك بوونی ئەو کاتە نیە کە کۆمەڵگای کۆمۆنیزمی کۆتایی تێدا پەیدا دەبێ، بەڵکو ئەو دەبەرێك ڕاچوون و ناکۆکی یە هەر لە سەرەتای دروست بوونی یەکەمین مرۆڤەوە لەسەر ئەم زەوییە هاتۆتە دی، بەڵێ ئینسان هەر لە یەکەمین ڕۆژی دەست پێ کردنی ژیانیی‌یەوە لەسەر ئەم خڕۆکەیە هەوڵی ئەوەی داوە، شارەزای یاسا و نهێنی یەکانی ئەم بوونەوەرە بێ و مەیسەری کات بۆ خۆی.

کەواتە : ئەم وەڵامەی مارکسی‌یەکان بە کەڵکی چ نەهات و بگرە بوو بە هۆی زیاتر ئاشکرا بوونی سادەیی بیر و زەینیان و ئەفسانەیی بیردۆزە و ڕێچکەکەیان.

ڕەنگە ئەم برە لێکۆڵینەوەیەش بەس بێ بۆ وەدرۆ خستنەوەی مارکسیزم لە وڕینەی ماتریالیزمی مێژوویی دا، زۆر زۆریش حەز دەکەم کە هەر کەسێك لە شوێن کەوتوانی مارکسیزم دەست لە سینگی خۆی بدا و بە نیازی بەرگری کردن لە مارکسیزم لە گەڵماندا بدوێ، ئەمما با پێشەکی ئەوە لە دڵی خۆیدا

**بچەسپێنێ کە حەتمەن بارێ بنەوەی پێ دەبڕێ. خوای گەورە و باڵا دەستیش پشتیوان بێ، ئەگەر تەمەن مەودای هەبێ بە هەویام لە کتێبێکی سەربەخۆدا سەر لەبەری بیردۆزەی مارکسیزم، لەسەر بنچینەی ژیری و زانیاری و لە ڕوانگەی ئیسلامی ئازیزەوە بدەمە بەر نشتەری توێژینەوەوە.**

## ئاڵقەی سێیەم

## وتووێژی سێیەم: ئیســـلام وریا کەرەوەیە نەک تریاک
## کات و شوێن : هەمان کات و شوێنی وتووێژی پێشوو

هەر لە هەمان کات و شوێنی گۆڕین دا، یەکێك لە دانیشتوان کە وا دیار بوو تا ئەو دەمی، کوفر و بێ بڕوایی، لە دڵی بەتاڵ و حەتاڵی دا[1]، جێ گیر نەبوو بوو، گوتی: کاکە دەبینم تۆ دەربارەی ئایین شارەزاییت هەیە، باشە ئەگەر زەحمەت نەبێ، بۆچی تۆزێك لەگەڵ ئەوانەدا نادوێی ئەوە هەر لە کن تۆ دەنگێ ناکەن، دەنا هەموویان بێ بڕوا و لامەزەبن و کەس زات ناکات هەر باسی ئایین و خواپەرستی بکات، کە بەر دەبنە کفر کردن و قسەی پڕووپووچ و دەڵێن: ئیسلامەتی ئەفسانەیە و (محمد) بۆ خۆی قورئانی داناوە و، خواپەرستی لە

(1) بۆیە دەڵێم "دڵی بەتاڵ و حەتاڵی" چونکە زۆر چاك دەزانم کە ڕێچکە و بیردۆزەکان تەنیا بە دڵێك دەوێرن و زەفەری پێ دەبەن کە خاڵی بێ لە ئیسلام.

ئەنجامی نەفامی یەوە پەیدا بووە و، ئێستا کە ئینسان چاوی کراونەوە و زانیاریی پەیدا کردوە، ئاییـــن و خواپەرستی باوی نەماوە و بێ ڕەواج بووە و ...هتد.

گوتم بە ڕاستی ئەمنیش زۆرم سەردەخورێ بۆ کارێکی وا، ئەمما پیاو هەقێ بلێ: هەڵایساندنەکەی پێی دەوێ، پێویست بە گوتنێ ناکات بۆ خۆت لە دانیشتنەکەی پێشوودا ئاگات لێ بوو، لە دوایی دا چەند پێ ناسەرسەنگ و نە قایل بوون، گوتی هەڵایساندنەکەی بۆ من لێ گەڕێ.

پاش نان خواردنێ بەیانی هەموومان دانیشتبوین هەر گوێ لەسەر هەست بووم، کە برادەری گۆرین قسەیەکی بکات بۆوەی بشێ بکرێتە دەستە چیلە.

زۆری نەخایاند ڕووی تێ کردم و گوتی: ئەرێ کاکە !

گوتم: بەلێ.. فەرموو.

گوتی: ئەرێ خەون و مەون چی بۆ هەیە ؟!

لێرەدا زانیم کە دەیەوێ بەو قسەیەی گفتەکەی پێشووی بەرێتە سەر، بۆیە بیرم لەوەی کردەوە کە بە شێوەیەك وەلامی پرسیارەکەی بدەمەوە، بگونجێ بکرێتە پێشەکی و ڕێ خۆش کەرێك بۆ چوونە نێو مەبەستی بنچینەیی یەوە سەرتان نەیەشێنم وەك بۆتان دەگێڕمەوە وتووێژ دەست پێ کرا :

+ زانا و پسـپۆڕانی دەروون ناسـی سـەبارەت بە چۆنیەتی تەفسیر کردن و شی کردنەوەی دیاردەی (خەون) ڕای جوێ جوێیان هەیە، بەلام لە ڕوانگەی ئیسلامەوە خەون دەکرێ بە سێ بەشەوە:

**یەکەم:** ئەو بەشەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتێکی "فسیۆلۆجی" وەك ئەو خەونانەی پەیوەندییان بە جینسەوە هەیە، فرۆید ئەم لایەنەی باش ڕوون کردۆتەوە  هەرچەندە هەندێك جاران ساتمەشی بردوە .

**دووەم:** ئەو بەشەیە کە پەیوەندی بە لایەنی بیرو زەینەوە هەیە، وەك هاتنەوە بەرچاوی ئەو شتانەی مرۆڤ لە کاتی بێیداری دا بیریان لیّ دەکاتەوە و پێیانەوە سەرقاڵە.

**سێیەم:** ئەو بەشەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ بنەمایەکی مەعنەوی، واتە لە ئەنجامی بیروخەیاڵ و کارتێکردنی غەریزەکان دا پەیدا نابێ، بەڵکو لە ئەنجامی کارتێکردنی جیهانی ئەودیوی سروشت (متیافیزیکا) وە دێتە دی، ئەمیش دوو جۆرە: جۆرێکیان دەگەڕێتەوە بۆ هێزە مەعنەوی و غەیبی یە خێرخواکان (القوی الغیبیة الخیرة)، وەك فێر کردن و ئیلهامی فریشتان و گیانی بێداری پیاو چاکان و بەندە لە خوا نزیکـــەکان، هەڵبەتە ئەم جۆرە مەگەر چۆنەکایی، دەنا تایبەتە بە مرۆڤە خواناس و بڕوادارەکانەوە.

جۆری دووەمیشیان دەگەڕێتەوە بۆ هێزە نەدیتراوە بەدەکان (القوی الغیبیة الشریرة) وەك خوتخوتەی شەیتان و ترساندن و بێزار کردن.

یەکێك لە دانیشتوان کە بە دکتۆر بانگ دەکرا، گوتی:

_ ئەگەر مەودام بدەی لەسەر قسەکانت تێ بینیم هەیە.

+ فەرموو.

_ سەبارەت بە تەفسیر کردنەکەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەشی یەکەمیان زۆر بەجێیە و شتێکی سەلمێنراوە لە لایەن زانیاری یەوە، بەشی دووەمیشیان هەر چۆنێك بێ ڕێی تێ دەچێ، بەڵام ئی سێیەمیان قسەیەکی ئایدیالیسمانەیە و هیچ پەیوەندی لەگەڵ زانیاریی دا نیە.

+ برا گیان بێ گومان پێویستە هەر شتێك زانیاری زەفەری پێ بەرێ و توانای بەسەردا بشکێ پرسی پێ بکەین و پشتی پێ ببەستین، بەڵام گەلێك جار

شتەکە ناکەوێتە نێو جوغزی زانیاری و ئەزموونەوە و هیچ سەرەدەری لێ ناکات و هاریی لێ لە بڕی ناکاتەوە، هەڵبەتە لە حاڵێکی وادا نالوێ بە تەما زانیاری بێ و چاوانی لەسەر چڕ داگرین، مەسەلەی خەونیش لێرەدا بەهەمان شێوەیە، ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە لایەنی کارئەندامی (فسیۆلۆجی) یەوە یە، زانیاری تا ڕاددەیەك دەبارانی دا هەیە لێی بدوێ. بەڵام ئاخر چ لە خەونێك دەکەی کە بە هیچ ڕەنگێك ناتوانی بی بەیەوە سەر بنەڕەتێکی ماددی و ناگونجێ بەو گەزە بپێورێ و لەو ڕوانگەیەوە سەیر کرێ !

وەك ئەو خەونانەی کە ئینسان تێیان دا ئاگاداری ڕوودانی کارەساتێك دەبێ بەر لە قەومانی ! یان لە شوێنێکی گەلێك دوورەوە، بە بێ هیچ هۆیەکی ماددی لە ڕێی خەونەوە دەزانێ چ ڕووی داوە[1] ؟!!

_ زانایان دەڵێن ئینسان بەهۆی هێزێکی نەدیتراوەوە[2] دەتوانێ پەی بەم تەرزە ڕووداوانە بەرێ.

+ ئێ ئێ خۆ ئێمەش دەڵێین هێزێکی نەدیتراو ئەو کارە بەجێ دێنێ، بەڵام ئەوە ئێمە دەڵێین ئەو هێزە بریتی‌یە لە فریشتە و گیانی بێداری دۆستانی خودا، بەڵام ئێوە چ دەڵێن و چ بریار دەدەن ؟!

_ پسپۆڕان بەو هێزە دەڵێن "هەستی شەشەم" .

+ برای ئازیز مەسەلە لێرەدا هەستی شەشەم و حەوتەم نیە، مەسەلە دەستەوستانی و دەستەو ئەژنۆ دانیشتنی زایناری‌یە لە ئاقار ئەو

---

(1) ئەمن یەکەبارێ خۆم ئەم جۆرە خەونانەم گەلێك دیون.

(2) وادیارە ئەوانە کە تینیان بۆ هات، پەنا دەبەنە بەر شتی هەست پێ نەکراویش !!

دیاردەیەدا، بەڵام ئەوانەی زانیاریی‌یان کردوە بە بتێك و دەی پەرستن، دەیانەوێ لە زاراوەی "هەستی شەشەم" پینەیەك  ئەگەر مقەباییش بێ  دروست کەن و هەر چۆنێك بێ کون و کەلێنێکی پێ بگرن، ئەگەر نا ئەو هەستە شەشەمە ئەگەر شتێکی ماددی‌یە نابێ هەستی پێ بکرێ؟

خۆ ئەگەر دەشلێن بەڵێ هەیە ئەما هەستی پێ ناکرێ، ئەوە بزمارێکی گەورە لە تابووتی بیردۆزەکەتان دەدەن و هەڵ دەقلێشێ و تەرمی سارد و سڕی بیردۆزەکەتان دەکەوێتە گۆڕێ.

چونکە ئێوە دەڵێن هەر شتێك بەرهەست نەبێ نیە و هەرچی وەبەر ڕکێفی چرا و شەداوی هەستەکان نەکەوێ مۆری نەبوونی پێوە دەنرێ.

برایان! بە ڕاستی[1] ئەم دیاردەیە  دیاردەی لە مرۆڤ ڕوانین و نرخاندنی لە گۆشەنیگایەکی کەمبەر و گچکەوە  گەلێك لە کەڵە پیاوو بلیمەتەکانی وەك فرۆیدی بەسەر تەڵێ پەڕاندوە و بە سەهووی بردوە.

بۆ وێنە: چونکە فرۆید پسپۆریی لە بواری دەروون ناسیی دا هەبووە و لەوێش دا لە جوغزی جینس دا خولاوەتەوە و ڕوانگەیەکی هەمە لایەنەو فراوانی شك نەبردوە، کاتێك ویستوویەتی ئینسان بنرخێنێ، وای زانیوە کە بەس لە گۆشەنیگای جینسەوە، لە وزەی دا هەیە سەر لەبەری لایەنە دیارو شێرراوە پێك هێنەرەکانی سروشتی مرۆڤ هەڵسەنگێنێ، لە ئاکامی ئەو

---

(1) لێرەدا خوێنەر هەست بە بازدانێکی کت و پڕ دەکات، بەڵام ئەم چەشنە بازدانە لێرەدا و لە گەلێك جێی دیش دا زۆر جاران خۆی فەرز دەکات، چونکە مەبەستی من هەرهێندە توێژینەوەی (خەون)ە هەتا دەبێتە دەستەچیلەیەك ئاگری وتووێژەکەی پێ خۆش دەکەم، واتە مرۆڤی موسڵمان دەبێ وریا و بەهۆش و گۆش بێ مەودا نەدات تووشی چۆرتمێ بکەن و بەهۆی باسە لاوەکی یەکانەوە لە مەبەستی بنچینەیی وەدوور خەن و هەتڵەی کەن.

بیرکردنەوە چەوتە و ئەو تێڕوانینە نا زانستیانەش دا تووشی هەڵەی زەق و ناقۆڵا بووە، کە هەندێك جاران بابای نەخوێندەواریش هەستیان پێ دەکات.

فرۆید دەڵێ: کۆرپەی ساوا کە قامکی خۆی یان مەمکی دایکی دەمژێ بە پاڵنەرێکی جینسی ئەم کارە دەکات، لە عەرزێ وەژەنینی پاچ و بێڵی بابای جوتیار و کرێکار و، گرتنی قەڵەمی خوێندکار و.. هتدیش هەر بەم جۆرە لێك دەداتەوە.

فرۆید بەوەندەشەوە ڕاناوەستێ و پتریش لینگان لە بەرێ تێ دەپەڕێنێ و خواپەرستی و ئایین پەروەریش بە فیتی جینس دەزانێ و ، هەروەك ڕق و قینێکی لە مێژینە پاڵی پێوە بنێ و بیەوێ کەف و کوڵی دڵی خۆی بە مرۆڤ بڕێژێ، تەمایەتی مرۆڤایەتی بە هەموو شتێکەوە لە جلێتاوی جینس هەڵکێشێ و خۆی لەبەر چاو ببێزێنێ، بەم شێوەیە بەسەرهاتی ئەفسانەیی "ئۆدیب" دەکاتە چاوگ و ماکی پەیدا بوونی ئایین و ڕەوشت و ئاکار و فەلسەفە و هونەر و...هەموو شتێك[1] .

---

(1) لێرەدا دەمەوێ پوختەیەك دەربارەی فرۆیدیسم بنووسم:

... زیگموند فرۆید لە ساڵی 1856 ی زایینی لە شاری (مزایرك) لە وڵاتی (ئەتریش) چاوی بە دنیا هەڵێناوە و، لە ساڵی 1939ز لە لەندەن مردوە.

هەڵبەتە فرۆید لە بواری دەروون ناسی دا پسپۆڕێکی کارامە و لێهاتوو بووە، وە چەند ڕاستی یەکی لەو بارەوە خستۆتە بەرچاوان کە بەر لەوی شتێکی شێرراوە و ڕازێکی پەنهان بوون، بەڵام پێشینان گوتوویانە: هەر خوا هەڵە ناکا و، هەریەکە بە سەهوو ناچێ، فرۆیدیش وەك هەر کام لە بەندەکانی دیکەی خوا، هەر ئەو برە وزە و توانایەی هەبوو کە خوا بە ئینسانی بەخشیوە تاکو برێك لە ڕاز و نهێنییەکانی ژیان و دەوروبەری پێ بزانێ. نەك بۆ زانین و پەی بردن بە گشت ڕاز و مەتەڵە سەر گێژکەرەکانی ژیان، چونکە ئەوە بەس لە خوا دەوەشێتەوە ئینسانیش چ حەوجێی نیە و پەکی لەسەری نەکەوتوە.

بەڵێ فرۆیدیش وەك سەر لەبەری ئەو مرۆڤانەی ویستوویانە لە ڕێی ژیری و زانیاریی ئادەمی یانەوە هەموو شتێك بزانن و هیچ ئاوڕیان وە ئایین و بەرنامەی خوا نەداوە و لە سەرچاوەی ڕوونی ڕێنموونی یەكانی خۆیان بێ بەش و دەسخەڕۆ كردوە، لە هەندێك شت دا ڕاستیی پێكاوە لە زۆربەش دا نەی پێكاوە و هەڵتریزاوە، كەواتە ئەوانەی وا دەڕواننە فرۆید و هاو وێنەی فرۆید كە پاك و بێخەوش بێ لەكەن و هیچیان لەبەر عاسێ نابێ و چیان لەبەر چەنگان ڕانابرێ، نە چی یەت (ماهیة)ی ئینسان دەناسن و، نە بڕواشیان بە گۆڕان و پەرەستاندن هەیە ، حەقیقەت و نێوەڕۆكی ئینسانیان نە ناسیوە چونكە شتێكی لێ چاوەڕوان دەكەن لە بارانی دا نیە و هەر لە خوای مەزن دەوەشێتەوە، بڕواشیان بە گۆڕان و پەرەستاندن نیە، چونكە ئەگەر بڕوایان پێ ی هەبا دەبوو بزانن كە ئینسانی سەدەی هەژدە و نۆزدە بۆی نیە نەخشەی ژیان بۆ خەڵكی سەدەكانی دوای خۆی دانێ !!

فرۆیدێك یان ماركسێك كە چەندین ساڵ بەر لە من ژیاوە و لە نێو بارودۆخێكی جودا لەوەی لە مەڕ من دا ژیاوە و بێ ئاگا بووە لەو شتە نوێیانەی لە دوای وی پەیدا دەبن و ڕێڕەوی ژیان دەگۆڕن و بێ هەواڵ بووە لەو بیردۆزە و تەجرووبانەی كە لەسەردەمی من دا دێنە كایەوە و ڕەنگە زۆر لە بۆچوونەكانی وی وەدرۆ بخەنەوە، بۆ دەبێ بیكەم بە بت و قسەكانی بكەمە ڕێشمەیەك و توند توند لە گەردنی خۆمی بئاڵێنم و خۆم بكەمە كۆیلەی ؟! ئایا گەڕانەوە بەرەو دوا و كۆنەپەرستی لەمە زیاتر دەبێ چۆن بێ ؟!!

ئێستا با بێینە سەروكاری فرۆید و ورێنەكانی:

ئەوەی بەلامەوە گرنگە و جێ ی سەرنج دانە لە بیردۆزەی فرۆیددا دوو شتی سەرەكین:

1- ڕوانینی فرۆید بۆ غەریزەی جینسی :

فرۆید هەموو هەستان و دانیشتن و چالاكی یەكانی ئینسان دەگێڕێتەوە بۆ غەریزەی جینسی و هەموو شتێك لە فیتی وی دەزانێ، واتە هەروەك چۆن ماركس ئابووری بە ژێر خان و بنچینەی ژیانی تاك و كۆمەڵ دادەنێ فرۆیدیش غەریزەی جینسی بەو چاوە سەیر دەكات.

2- هەڵوێستی فرۆید سەبارەت بە دیاردەی خواپەرستی و ئایین:

فرۆید پێ ی وایە كە خواپەرستی و ئایین وەك هەموو چالاكیەكانی دیكەی مرۆڤ غەریزە جینسی بۆتە هۆی پەیدا بوونی!!

فرۆید بۆ سەلماندنی ئەم ورێنەیەی بەسەرهاتێكی ئەفسانەیی كۆن دەكاتە بەڵگە و سەرچاوەی ئیلهامی خۆی، ئەمەش دەقی ئەو بەسەرهاتەیە كە فرۆید دەی گێڕێتەوە:

"سەرەدەمی زوو خێزانێك هەبوە كە لـە باپێك و كۆمەڵێك ژن و كچ و كوڕ پێك هاتوە، بابەكە هەموو خێزانەكە دەخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە بە تایبەتی ژن و كچەكان، وە لـەگەڵ كوڕەكانی دا زۆر بە دڵ ڕەقی و توند و تیژی ڕەفتار دەكات ئاوا ژیان بەردەوام دەبێ، تا بابەكە لـە ئەنجامی پیری و نەساغی دا بە دەستی كوڕە ڕق لێ هەڵگرتووەكانی دەكوژرێ، بەڵام هیچ كام لـە كوڕەكان دەخۆی ڕا نابینێ شوێنی بابی بگرێتەوە، نەوەك بە مەرەدی وی بچێ.

ئینجا لـە ئاكامی كوژرانی بابەكە و ترس و یاساغ كردنی هێنانی ئافرەتانی ئەو تیـــــــرەیە، یەكەمین دەستوور و یاسای مرۆڤایەتی و مەعنەوی سەری هەڵدا و، بەردی بناغەی خواناسیش ڕۆنرا !!

چونكە كوڕەكان كەوتنە ڕێز گرتن و بە چاك و پاك لێ ڕوانینی بابیان و، ئینجا ئەو ڕێز گرتنەش تەشەنەی كرد و بوو بە پەرستن، ئینجا پەرستنی بابەكە وازی لێ هێنراو گۆڕا بۆ پەرستنی گیاندار و ڕووەك و داروبەرد، لـە دواییدا ئاستی پەرستنەكە ژووررێاتر چوو بوو بە پەرستنی هێزێكی نەدیتراو، بە ناوی خودا !!".

جا ئێستا با نۆرەی ئەوە بێ كە بە چاوێكی وردبین و ڕەخنە گرانە سەرنجێكی خێرا لـە هەر كام لـەم دوو خاڵـە بدەین.

جارێ قسە لـە خاڵی یەكەمیان دەكەین و دەڵێین:

یەكەم: ئەمڕۆ لـە نێو پسپۆڕ و شارەزایانی دەروون ناسیی دا  چاوپۆشی لـە موسڵمانەتی و نا موسڵمانی یان بكە  كەم كەس هەیە بتوانێ ئەو قسانەی فرۆید قبووڵ كات، چونكە هەر كەسێك تۆزوكێك وردبوونەوەی هەبێ دەزانێ كە وێڕای غەریزەی جینسی چەندەها عامیلی دیكەش هەن كە كار دەكەنـە سەر ژیانی ئینسان، وەك : غەریـــزەی خواپەرســـتی و غەریـــزەی موڵكایەتی و غەریزەی شت زانین و زانیار بوون و غەریزەی شەیدایی جوانی ی و ڕەوشت و ئاكاری بەرز و غەریزەی خۆ دەرخستن و ..هتد.

جا ئێستا ئەم پرسیارە ئاراستەی بیردۆزەی فرۆید دەكەین:

ئایا ئەگەر  گریمان  غەریزەی جینسی لـە سروشتی مرۆڤ دا نەبایە، مرۆڤ بە دوای خواناسی و زانیاری و ڕەوشت بەرزی و جوانی و خۆراك و پۆشاك و پایە و پلـە و ...هتددا عەوداڵ نەدەبوو ؟!!

دووەم: هیچ بەڵگەیەكی ژیرانە و زانستانە نیە بۆ وەڕاست گێڕانی ئەو قسانەی فرۆید ، چونكە لـە ڕاستی دا فرۆید بێجگە لـە لاف لێدان و گوتەی ڕووت و بێ پشت و پەنا چیدی بە چەنگەوە نیە.

سێیەم: فرۆید هەر بە جارێك ژیری و بیر و هۆشی مرۆڤی فەرامۆش کردوە و هیچ جۆرە دەورێکی بۆ دیاری نەکردوە، ئەمما مرۆڤایەتی تێکڕا بە زانا و نەزان و کافر و موسڵمانەوە لەسەر ئەوەن کە مرۆڤ بەس بریتی نیە لە تۆپەڵێك هەوا و ئارەزوو و ڕابواردن و، وێڕای ئەوەش ژیری و بیر کردنەوەش زۆر لە ڕەفتار و ئاکارەکانی دەخاتە ژێر نیر و دەسەڵاتی خۆیەوەو، بیـر و هۆش وەك سفری دوای فاریزە نا کاریگەر نیە.

چوارەم: ئەو بەسەرهاتەی فرۆید دەی کاتە بنچینەی بیردۆزەکەی ئەفسانەیی و پووچە بەم بەڵگانەی خوارێ:

1- دەڵێن جارێکی مەلای مەزبوورە بە بیورێکی تیژ وە دارێکی دەبڕێ بە نیازی برینەوەی، بەڵام هەر ئەو لاخەی کە لەسەری ڕاوەستاوە جێی نیازی مەلای دەبێ، هەڵبەتە زۆر نابا مەلا سەرەنگرێ دەبێ و بۆ خۆشی نازانێ، یەکەم جار کوێی ڕمبەی لە زەوی هێناوە ! دەجا فرۆیدیش لێرەدا ڕاسـت بە مەرەدی وی چووە!

ئەو کە دەڵێ: بابەکە دەستی بەسەر هەموو ئافرەتانی خێزانەکەدا گرتوە: دەبێ پاڵنەرێك هەبوو بێ پاڵی پێوە نابێ کە بەو کارەی هەستێ، بە لایەنی کەمەوە دەبێ غەریزەی موڵکایەتی تاك و خەسڵەتی ئێرەیی بردن (حەسوودی)ی تێدا هەبووبێ، دیسان کاردانەوە "رد الفعل"ی کوڕەکانیش یەکی لەسەر غەریزەی تۆڵە ستاندنێ کەوتوە، کەواتە: هەر کام لە غەریزەی موڵکایەتی تاکی (الملكية الفردية) و ئێرەیی و تۆڵە ستاندن، پێویستە لە دروست کردنی ئەو بەسەرهـــاتەدا  ئەگەر گریمان ڕاست بێ  لە پێش غەریزەی جینسی یەوە دابنرێن، یان هەر نەبێ وێڕای وی حیسابیان بۆ بکرێ.

2- چ بەرژەوەندییەکی جینسی  ئەگەر فرۆید ڕاست دەکات جینس سەرچاوەی هەموو شتێکە  پاڵی بە کوڕەکانەوە نا ، کە لە پاش مردنی بابیان ئافرەتانی ئەو تیرەیە لەخۆیان حەرام بکەن و بۆچی دوای لە نێو چوونی بابەکە هەموو ئەندامانی خێزانەکە نێری و بەرانی بەرنەبوونە یەکدی و سەرگەرمی قم بوون نەبوون لە جلێتاوی جینس دا ؟!!

سەبارەت بە خاڵی دووەمیشیان دەڵێن:

یەکەم: فرۆید ئەزموونەکانی خۆی لەو بارەوە بەس لە نێو چوارچێوەی ئەو تیرە وەحشی یانەدا ئەنجام داوە کە بە (طوطميس) ناسراون، چونکە زانیویەتی باروزرووف ئەو تیرانە چاکتر لەگەڵ بیردۆزەکەی دا دەسازێ  هەر کام لەو تیرە و هۆزانە کە بە (طوطميس) ناسراون ئاژەڵێك یان ڕووەکێك دەپەرستێ و بە بابە گەورەی خۆی دادەنێ  .

دیسان لە نێو هەموو ئایین و ڕێڕەوەکان دا بەس مەسیحایەتی هەڵبژاردوە، چونکە ئەوان خوا بە ناوی (باب) بانگ دەکەن، تەنانەت فرۆید ئایینەکەی خۆشی  کە جوولەکایەتی یە  پشت گوێ خستوە زانیویەتی لەگەڵ بۆچوونی وی‌دا هەڵناکات !!.

کەواتە فرۆید بۆ سەلماندنی قسەکانی بەس بە شوێن ئەو دیاردانەدا گەڕاوە کە لەگەڵ بیردۆزەکەی دا هەڵ دەکەن، مادام وایێ بە شێوەیەکی زانستییانە و واقیعی یانە بە شوێن ڕاستی دا نەگەڕاوە دیارە فرۆید لەو جۆرە ڕەفتارەی‌دا هەر بە تەنێ نیە و، هاوەڵی زۆرن ، مارکسی‌یەکان کە خۆیان بە شوێن کەوتووی شێوازی زانستی یانە دەزانن، گەلێك جاران هەمان ڕەفتاری فرۆید دەگرنە بەر و، بەس بە شوێن ئەو جۆرە زانیاری‌یەدا عەوداڵن کە لەگەڵ بیرۆچکەکەیان دا دەسازێ و هەر زانیاری‌یەك لەگەڵ بۆچوونی وان دا نەگونجێ بە ئەفسانەی دەزانن، بە هەڵوێستی ئەوانەش ڕەفتارە نەفاماناکەی (خولە بەردەڕەشی)م دێتە یاد کە ساڵی (1981) لە دێی (بەردەڕەشی)(( بەردەڕەش:گوندێکە دەکەوێتە نێوان هەردووك شارۆچکەی (سەردەشت) و (بانە) ی کوردستانی ئێران ، واتە ئەو گوندەی من مەبەستمە ئەگەر نا (بەردەڕەش)ی دیکەش هەن)) بووم و دەرسی بیرکاری (ماتماتیك) م فێری کابرایەکی دوکان دار دەکرد ناوی خولە بوو، خولە بە سینگ فراوانی یەوە گوێی بۆ : کۆکردنەوە و لێکدان و دابەش کردن گرت، بەڵام کە گەیشتینە سەر دەرسی لێ دەرکردن (ناقص) مردام و سووتام نەی خوێند، بە بەهانەی ئەوەی، ئەو قەت نایەوێ زەرەرێ بکا و پارەکەی لێی کەم بێتەوە، کەواتە حەوجێی بەو باسە نیە !! .

دووەم: فرۆید کە بابایەکی جوولەکە بووە، لە لایـــــەن کلێسا و شوێن کەوتووانی یەوە بەردەوام لێشـــاوی تانە و تەشـــــەر و ڕەخنان ڕووی تێ کردوە، بۆیە هەر لە ڕۆژێکی گـــەڕاوە، دەرفەتی دەست بکەوێ بۆ تەقاندنەوەی بوڕکانی بوغز و قینی بە ڕووی کلێسا و دام و دەزگاکان دا.

خۆ هەر لانی کەم ئەگەر بەو جۆرەش فروید تاوانبار نەکەین، بە پێی بنەماکانی زانیاری دەروون ناسی ی، ناتوانین باوەڕ بکەین کە ئەو هەموو سەرکۆنە و بە سووك سەیر کرانەی فرۆید لە لایەن کلێساوە، بە تاوانی جووایەتی کە لە ســــــــەرەتای قوتابی یەتی یەوە تا کۆتایی ژیانی درێژەی کێشاوە  هیچ جۆرە شوێنەوارێکی خراپی لە بەشی ئەودیو شعوور (لا شعور)ی فرۆیددا بەجێ نەهێشتبێ.

سێ‌یەم: بێ گومان فرۆید جوولەکەیە و میللەتی جوولەکەش، لە دڵی هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەدا بوغزێنراوو نا پەسەندن، چونکە جوولەکە سەبارەت بە گشت گەلانی دنیا بوغز و

غەرەزیان هەیە و دەڵێن پێویستە خێر و بێرەکانی دنیا سەر لەبەر لە ژێر ڕکێفی مەدا بێ و گەلانی دیکە وەك ئاژەڵێك ڕام بکرێن بۆ بەرژەوەندی یەکانی مە.

جا لەبەر تیشکی ئەم ڕاستی‌یەدا دەتوانین بڵێین: فرۆیدیش وەك دوو هاو ڕەگەزەکەی دیکەی: مارکس ودورکایم، ویستوویەتی لە بن شاقەلی بیردۆزەیەکی بە ناو زانیاری یانەدا، ڕق و داخی خۆی بە مرۆڤایەتی بڕێژێ و بە زمانی حاڵ پێیان بڵێ: ئەوەی ئێوە بە ناوی ئایین و خواناسی و ڕەوشت و ئاکاری پەسندەوە ڕێزی لێ دەگرن، ئەو سەرچاوە ڕوون و بێ گەردەی نیە کە ئێوە گومانتان بۆی چوە، بەڵکو وەك سپیاڵێکی پیس نۆکەرەتان لە زەلکاوی جینس وەردراوە !!

هەر کەسێکیش ئەم چەند دێرەی پرۆتۆکۆلاتی جوولەکەکان وەخوێنێ، هیچ دوو دڵی و گومانی لە ڕاستی ی ئەم بۆچوونەدا نامێنێ.

"فرۆید لە خۆمانە و بەردەوام سەرگەرمی کارە، دەیەوێ جینس بئاخنێتە نێو هەموو شتێکەوە، تاوەکو چینی گەنج و تازە پێ گەیشتووی ئۆمی یەکان ڕێز و پایەیەکی زۆر بۆ جینس دانێن و، لە ئاکامیش دا مەبەست و هیوای هەرەبەرزی هەر هەرزە کارێکی وان  واتە ئۆمی‌یەکان، کە مەبەستیان لە ئۆمی گەلانی دیکەی غەیری خۆیانە  بەس تێر کردنی گەدە و لایەنی جینسی بێ، جا ئەو دەمیش ڕەوشت و خوو و ئایین دەفەوتێن و بە سێنایی بەسەر دوژمنەکانمان دا زاڵ دەبین و بە ئامانجی پیرۆزمان دەگەین ...."

چوارەم: ئێستاش ڕای دوو پسپۆڕی لێهاتووی دەروون ناسی ی سەبارەت بە ئایین و سروشتی خواناسی دەخەینە ڕوو!

1- ئەریك فرۆم: زانای هەڵکەوتووی ئەڵمانی و نووسەری چەند کتێبی بایەخ داری دەروون ناسی و شوێن کەوتووی بیردۆزەی (فرۆیدیسمی نوێ)، لە کتێبی (دەروون ناسی و ئایین) دا، لە باسێکی دا بە ناوی: "ئایا دەروون ناسی ی جێ ی مەترسی یە بۆ ئایین؟" دەڵێ:

"..دەروون ناسی نەك هەر بە هیچ ڕەنگێك جێ ی مەترسی نیە بۆ ئایین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەتوانێ یاریدەیەکی باشیشی بدات، ئایین لە لایەن هیچ زانیاری یەکی دیکەشەوە هەڕەشەی لێ ناکرێ، چونکە هیچ ماقووڵ نیە پەی بردن بە یەکێك لە زانیاری‌یە سروشتی یەکان مەترسی یەکی تێدا بێ بۆ تەرزی فیکری ئایینی، بەڵکو بە بەراوەژووە وە شارەزایی زیاتر سەبارەت بەم جیهانەی تێیدایین بەس دەبێتە هۆی پتر بڕوا بە خوا بوون و خۆ بە گچکە زانین لە ئاقار خوادا.

ئەوەی کە دەبێتە جێی مەترسی بۆ ئایین لە لایەن زانیاری یەوە نیە، بەڵکو لە لایەن هەڵس و کەوتەکانی ئێمەوەیە لە ژیان دا، ئینسان لە هەوڵ دانی دا بە دوای ئامانجی بەرزی ژیانی دا  کە خوا پەرستی یە: وەرگێڕ  دەستی کێشاوەتەوە و خۆی هێناوەتە سەر بیچمی شمەك، لە پێناوی خزمەت کردن دا بەو دام و دەزگا ئابووری یەی کە دەسکردی خۆیەتی، ئینسان زیاتر سەر گەرمی بە خۆدا هاتن و پێهەڵا بردنی باری ژیانی ماددی یەتی، نەك بەختەوەری و پاکردنەوە و گەشە پێدانی کیانی، بە تەعبیرێکی وردتر بڵێم، دیاردەیەك کە لە هەموو شتێك پتر سەبارەت بە ئایین مەترسی لێ دەکرێ ، ئەو دیاردەیەیە کە من پێی دەڵێم: شەیدا بوونی دنیا".

2- ویلیام جیمز: پرۆفیسۆر و دەروون ناسی بە شۆرەت. لە کتێبی :

**(ئایین و گیان) لە بەشی شەشەمی دا لە ژێر سەرباسی: "بایەخی ژیانی دینداران" دا دەڵێت: گەورەترین ئیمتیازی ژیانی خواپەرستانە ئەمانەی خوارێن:**

**یەك :- ئەم بەشە بەر هەستەی کە دەی بینین، بەشێکە لەو جیهانەی کە نایەتە بەر نیگا، ئەم بەشە دیراوو بەرهەستەش حەقیقەت و بوونی خۆی لەو دنیا غەیبیەوە دێنێ، کە لە ڕێی هەستەکانەوە پەی پێ نابەین.**

**دوو:- هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ هەردووك بەشەکەی جیهان دا و پەیدا کردنی هاوسەنگی و هاو ئاهەنگی لە نێوانیان دا ئامانجی هەرە بەرزە..**

**سێ :- دوعا و نوێژ، یان بە تەعبیرێکی دی، پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا. شتێکی کاریگەرە و ئەنجامی هەیە، واتە بە جۆرێکی هەست پێ کراو شوێنەواری ماددی و مەعنەوی هەیە.**

**بێجگە لەمانەش ژیانی ئایینی و خوادۆستی خاوەنی دوو خەسڵەتی دیکەی فرە بایەخ دارە!**

**أ- ژیان هێندە بە تام و لەزەت دەبێ، سەر لەبەر دەبێتە خێر و خۆشی و ڕەحمەت ، ژیانی مرۆڤی خواپەرست لێواو لێو دەبێ، لە چالاکی هەستیارانە و دارماڵ دەبێ لە کامەرانی و سەرو ڕوو خۆشی مەردانە.**

**ب- جۆرە ئارامی و ئۆخژنێکی دەروونی پێك دێ، کە شوێنەوارە ڕواڵەتی یەکانی بریتین لە خزمەت گوزاری و چاکە کردنێکی بێ سنوور.**

**بۆ نووسرانی ئەم پەراوێزە وێڕای وردبوونەوەی خۆم، سوودم لەم کتێبانەش وەرگرتوە:**

**(1) انگیزهٔ پیدایش مذاهب، ناصر مکارم شیرازی، لە لاپەڕە : 231 تا 244.**

**(2) دائره المعارف روانشناسی، کۆمەڵە پسپۆڕێك، لاپەڕە (71).**

**(3) التطور والثبات في حياة البشرية، محمد قطب تەرجەمەی فارسی، لاپەڕە (87).**

**(داروین)یش کە لە دەلاقەی ئاژەڵناسی یەوە تەماشای مرۆڤ دەکات، دیمەنی مێژووی مرۆڤایەتی وەك دیمەنی ڕەوە گورگ و گاڕانێك دێنێتە بەرچاوان کە بەردەوام بە دەسەڵات و خاوەن هێزەکان لە دژی بێ دەسەڵات ولاوازەکانن و مانەوە وتەمەن درێژی بە تەنێ بە بـــاڵای ئەوانە بڕاوە کە ئەستۆیان ئەستوورترە ونینۆك و دانیان درێژ ترو بڕندە ترن، بە کورتی خوێن ڕێژترن !!**

هەر کەسێك لە یاساکانی : دووبەرەکێی مانەوە (تنازع البقاء) و هەڵبژاردنی سروشتی (الانتخاب الطبيعي) مانەوە بۆ چاکترین (البقاء للاصلح ) ورد بێتەوە هەر ئەو دیمەنەی بە بیردا دێ کە گوتمان .

"دورکایم[1]" یـش کە بەس لە گۆشـەنیگای کۆمـەڵناسی یەوە سەرنجی مرۆڤ دەدات، دەڵێ: کۆمـەڵگا فابریقەیە و مرۆڤیش بە ئایین و ڕەوشت و هونەر و ئەدەب و..هتدیەوە وەك ئامرازێك وایە کە لە فابریقەیەك دا دروست دەکرێ، ئینسان هەر هێندە دەور دەبینێ لە دروست بوونی دا کە ئامرازی تاین دەی بینێ، بە کورتی بە ڕای دورکایم مرۆڤ لە ئاقار تین و تەوژمی کۆمەڵگادا لەو پەڕە مریشکە بێ ئەمیەت و بێ ئیـرادەترە کە دەکەوێتە بەر گیڤە گیڤ و تەوژمی بایەکی ڕاپێچك دەر.

"نیتشەش"[2]کە ویستوویەتی لەسەر بنچینەی غەریزەی هێز بەکارهێنان و ڕق و بوغز و تووڕەیی  کە یەکێکە لە بەشە پێك هێنەرەکانی مرۆڤ  مرۆڤ بنرخێنێ و یاسای " الحق مع القوة " ی بۆ داناوە.

---

**(4) دین و روان، ویلهام جهمز. لاپەڕە (177، 178).**

**(5) روانکارەی و دین، اریك فرۆم، لاپەڕە (120).**

(1) دورکایم کۆمەڵناسی فەرەنسایی لە ساڵی 1858ز چاوی بە دنیای ڕوون هەڵێناوە و لە ساڵی 1927ز لە پاریس مردوە، اطلاعات عمومی لاپەڕە ، (635).

(2) فریدرید ویلهلم نیتشە: شاعیر و زانای ڕەش بینی ئەڵمانی لە ساڵی 1844ز لە دایك بوە.

"سارتەریش" کە بە پێچەوانەی دورکایمەوە لە دەلاقەی کەمبەری تاکی یەوە دە ئینسان دەفکرێ و دەڵێت: مرۆڤ هەتا کەمتر بە خەم ئایین و ڕەوشت و یاساوە بێ و کەمتر گوێ بداتە کۆمەڵگـــا زیاتر دەتوانێ ئـــــــازادی و مرۆڤایەتی خۆی لە واقیع دا بچەسپێنێ [3] .

---

(3) وای بە چاك دەزانم نەختێك ڕووناكی باوێینە سەر ڕێچكەی بوونایەتی (ئەگزیستانسیالیزم) كە سارتەر یەكێكە لە پێشەوایەكانی وێڕای هەر كام لــە :

1- كیركجارد: فەیلەسووفی دانیماركی 1713 _ 1855ز.
2- گابریل مارسیل، كە لە ساڵی 1889ز مردوە.
3- مارتن هایدگری ئەڵمانی ، لە ساڵی 1889ز لە دایك بووە.
4- ژان پول سارتەر، لە ساڵی 1905ز لە دایك بوە و ناودار ترین پێشەوا و نوێنەری ئەم ڕێچكەیە.

هێڵە سەرەكییەكانی ئەم ڕێچكەیە لەم سەردەمەدا ئەمانەن:

یەكەم: بێ بڕوایی و بە هیچ سەیر كردنی ئایین و ڕەوشت و دەستوور و یاسا و گشت داب و نەریتە كۆمەلایەتی یەكان و بە ڕەش بینانە ڕوانینــە بوونەوەر و ژیــــان، بۆ وێنــــە ئەمە یەكێكە لە قســـەكانیان:

" ... لە بوونەوەر و ژیان دا هیچ شتێك نیە شیاوی سەرنج دان و تێوەڕامان بێ، دنیای تێكڕا هیچ و پووچ و نا ماقوولە !.."

دكتۆر "یحی هویدی" لە كتێبی (مقدمة في الفلسفة) دا دەڵێ: زۆربەی وجوودی یەكان دیمەنێكی ڕەش و تاریك و دزێو دەربارەی بوونەوەر و ژیان دەخەنە بەرچاوان كە بریتی یە، لە خەم و خەفەت و نارەحەتی و دڵە ڕاوكێ و ڕەش بینی، سارتەر لەو بارەوە دەڵێت: مرۆڤ لە هەر تاوێك دا كە لە ژیانی ڕادەبرێ ، هەست بە ڕشانەوە دەكات، تەنانەت سارتەر كتێبێكی هەیە بە ناوی (ڕشانەوە).

دووەم: بەرهەڵدایی و گوێ نەدان بە ئایین و ڕەوشت و یاسا لە ژێر پەردەی ئازادی دا، لەم ڕووەوە دەڵێن: ئینسان هیچ ئامانج و مەبەستێكی لە ژیانیدا نیە، وە كەس نەی خوڵقاندوە و لە خۆوە هاتۆتە دی، هیچ هێزێكیش نیە ڕێ و شوێنێكی تایبەتی بەسەردا فەرز كات، چ بە

مارکسیش[1]دیسان وەك هەموو ئەوانەی لە گۆشەنیگای گچکە و کەمبەرەوە لە ئینسان ورد دەبنەوە ، ئەویش هەر بە هەمان پیَ و دان،

---

ناوی ئایین و بەرنامەی خوایی یەوە بێ و چ بە ناوی ڕێ و ڕەسمی کۆمەڵایەتی، ڕێ نیشاندەری مرۆڤ بۆ جۆر و چۆنیەتی ژیانی ئازادییە و هیچی دی.

سێیەم: بڕوا نەبوون بە سروشتێکی هاوبەش لە نێو مرۆڤەکان داو، بڕوا بوون بەوە کە هەر ئینسانێك زاتێکی تایبەتی یە و سروشتێکی سەربەخۆ و جودای هەیە.

بێ گومان لە ڕوانگەی ئیسلامەوەش بەندەکان لەبواری بەرپرسیاری وسزاو پاداش دا سەربەخۆن، ئەمما ئیسلام وێڕای ئەمەش دەڵێ: مرۆڤایەتی دیاردەیەکە گشت مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن و چەند خەسڵەتێکی مرۆڤانە هەموویان پێکەوە گرێ دەدات.

چوارەم: سەیر کردنی کۆمەڵگا بە چاوی بێزران و دوژمنایەتی یەوە، چونکە ئازادی تاك (فرد) ئەگەر هیچ لەمپەرێکی نەیەتە بەر، ئازادی تاکەکانی دیکەی. لە ڕێی دا دەبێتە کۆسپ و ئاستەنگ بۆ وێنە: هیچ کەسێك ناتوانێ هەرچی ئافرەتی جوان و دڵگیر هەیە بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، چونکە کاتێك ئەمەی کرد  ئەگەر گریمان بۆی کرا  لە بەردەم ئازادی تاکەکانی دیکەدا بۆتە کۆسپ و زەڕی لێداون و ئازادی لێ زەوت کردوون، خۆ ئەگەر بۆشی نەکرا ئەوە ئەو ئازادی ی لێ حەپس کراوە، جا بۆیە سارتەر دەڵێ: ئەوانەی ئازادیم لێ دەگرنەوە و لە ڕێی ئارەزووەکانم دا دەبنە کۆسپ و لەمپەر دۆزەخن بۆ من !!

خوێنەری ئازیزم:

ئەوەی ڕابرد پێناسە کردنێکی فیکری بوونایەتی (الوجودية) بوو، بۆیەش زەحمەتی ڕەخنە لێ گرتنیمان نەدایە بەرخۆ، چونکە لەگەڵ پووچیشیدا بیرێکی یەکجار سادە و شێتانەیە، بەڵێ بە بڕوای من هەر موتالاَ کردنی ئەو چەشنە بیرانە بەسە بۆ ڕەد لێ دانەوەیان .

بۆ نووسرانی ئەم پەڕاوێزە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرت:

1- دائرة المعارف زرين: لاپەڕە (788)، مهرداو مهرين.
2- دائرة المعارف روانشناسي، لاپەڕە (64).
3- الوجودية والغثيان  محمد جواد مغنية، لە لاپەڕە (31) ڕا تا (37).

(1) کارل مارکس لە ساڵی 1818ز لە شاری (ترير) لە ئەڵمانیا ، لە دایك و بابێکی جوولەکە وە پاش کەوتووە و لە ساڵی 1873لە لەندەن مردوە.

تەنیا سەیری لایەنی ماددی و ئاژەڵی مرۆڤ دەکا و، دەیەوێ لە دەلاقەی ئابووری یەوە سەر لەبەری ئینسان بەدی بکا و، مێژووی مرۆڤایەتی ی وا دێتە بەر نیگا کە هەردەم تێك هەڵدان و پێك دادانی چینەکانی کۆمەڵگا بوە، لەسەر گەدە پڕ کردن و گیرفان ئاخنین و ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ !!

برایان لێرەدا ئەم باسە قوڵە نەزیلەیەکی وەبیر هێنامەوە حەز دەکەم بۆتان بگێڕمەوە:

دەگێڕنەوە کۆمەڵە چاوەشێك (فیل)ێك دێنن بۆ شارێك، تاقمە کوێرێك ئەو هەواڵەیان وەبەر گوێیان دەکەوێ و بڕیار دەدەن کە وێکڕا بچن بۆ کن چاوەشەکان و بزانن ئەو دەعبایەی پێیانە چیە و چۆنە.

بەڵێ دەگەنە کن فیلەکە و لەبەر نەبوونی چاوان هانا وەبەر هەستی دەست لێ کوتانێ دەبەن، ئیدی هەر یەکە لە لایەکەوە دەست لە جەستەی فیلەکە دەکوتێ و دوایی دەڕێیە خۆڕا دەگەڕێنەوە، کە دەچنەوە خەڵك دەربارەی فیلەکە پرسیاریان لێ دەکەن و، داوایان لێ دەکەن کە باسی چۆنیەتی ئەو گیاندارەیان بۆ بکەن داخوا چۆنە و وەك چ دەچێ ! ئەوەیان کە دەستی لە گوێی کوتاوە دەڵێ: وەڵڵا چتان عەرز کەم شتێکی پانکۆڵەیە وەك گەڵای دارێ، ئەوی دیکەیان کە لاقی فیلەکەی وەبەر دەستی هاتوە، دەڵێ: کوڕە بێ قەزابێ گەڵای چی (فیل) شتێکە وەك کۆڵەکە وایە ! ، ئی سێیەمیان کە دەستی لە پشتێ کوتاوە دەڵێ: شتاقتان ڕاست ناکەن، فیل دەعبایەکە وەك تەختە دارێکی بە وەج و مەیلە و پان و

---

بەڵێ خوێنەری بەڕێز، ئەو مارکسەی کە ئەمڕۆ بڕێك گەنجی هەرزەکار و لاساکەرەوەی بێ ئەزموون بە بابی خۆیانی دەزانن و دەڵێن ئێمە نەوەی وین، بابایەکی جوولەکە و بێ دین بووە !!

درێژە !، چوارەمیان کە دەستی لە لمبۆزی کوتاوە دەڵێ: هیچتان هارێی لـێ لە برێ ناکەنەوە، فیل شتێکی درێژ کۆڵەیە و سەرێکی وەك قەڵانگی دوولا هاتۆتەوە، پێی ناوێ گۆچانی ببینن و فیلی ببینن بێ کەم و زیاد !!

جا بە ڕاستی برایان مەسەلەی فیل و کوێرەکان ڕاستە و ڕاست وەك مەسەلەی ناسینی مرۆڤ و ڕێچکە و بیردۆزە مرۆڤ کردەکان وایە، چونکە هەر کام لە کوێرەکان لەو جوغزە تایبەتی یەی کە پسپۆڕی تێیدا هەیە و دەستی تاقی کردنەوەی پێی گەیشتوە وەك دووخـێ ڕاست دەکات، بە هەمان شێوەش هەر کام لە فرۆید وداروێن و سارتەر و نیتشە و دورکایم و مارکسو .... هتد لەو جوغزە تایبەتی یەدا کە دەکەویتە بەر قەڵەمڕەوی پسپۆڕی و شارەزایی یەکەی و دەستی وێڕا دەگات ئەگەر لە **100/100**یش [(1)] ڕاست نەکات، تا ئەندازەیەك توانیویەتی پەی بە ڕاستیبەرێوسەرو سیمای بناسێ.

دیسان هەروەك چۆن کوێرەکان تێکڕا لە پەی بردن بە واقیع و حەقیقەتی فیلەکە بە شێوەیەکی هەمە لایەنە،بە هەڵەدا چووبوون، هەر کام لەو زانا و پسپۆڕانەش کە بە هەویا بوون لە دەلاقەیەکی گچکەوە هەموو لایەنەکانی ئینسان ببینن لە ناسینی سروشت و چییەتی مرۆڤ دا ساتمەیان بردوە و هەڵتریزاون و، بەرەو پشت وەعەرزێ کەوتوون و تخێڵ بوون.

---

(1) ڕەنگە یەکێك بپرسێت، باشە بۆچی کوێرەکان لە مەودای تەجرەبە و جوغزی پسپۆڕی یەکەیان دا قسەکانیان وەك دووخێ ڕاست دەردەچێ، بەڵام قسەی خاوەن بیردۆزەکان وانیە ؟! دەڵێین چونکە لە مەسەلەی کوێرەکان دا زانیاری و ئەزموونی ڕووت لە ئارادا بوە. ئەمما لە ئی خاوەن بیردۆزەکان دا هەوا و ئارەزوو و بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیش دەستیان ڕەگەڵ کارەکانیان کەوتوە.

هەڵبەتە لە کەستان ون و شێرراوە نیە چ کوێرەکانیش و چ خاوەنی بیردۆزەکانیش لە سۆنگەی ئەوە دووچاری سەرچەنگ چوون بوونە، کە زیاتر لە مەودای بەرەی پسپۆڕییەکەیان لینگی بیردۆزەکانیان ڕاکێشاوە.

بەڵێ ئەگەر فرۆید وەك غەریزە و بەشێکی پێك هێنەری ئینسان لە لایەنی زایەند (جینس) دوابا، قسەکانی وەك شتێکی زانیاری یانە لێ وەردەگیران  چاو پۆشی لەوە بکەین داخوا هەموو قسەکانی بە جێن یان نا چونکە ئەو دەمی قسەکانی ئەنجامی ئەزموون و تێوەڕامانی عیلمیانە دەبوون، ئەمما خڕ کردنەوەی ئینسان بە کوڵك و پێستەوە و دەنێو جوغزی زایەند پەستاوتنی، وەك خڕ کردنەوەی فیلەکە وایە بە دەستی بابای کوێر و کوتر لە نێو جوغزی گوێی دا !!

هەر بەم پێ و دانەش کورت هەڵێنان و گچکە کردنەوەی مرۆڤ لە نێو چوارچێوەی ئاژەڵایەتی، یان تاك، یان کۆمەڵگا، یان ئابووری ڕاست وەك کورت هەڵێنان و تێ پەستێنرانی فیلەکەیە بە هەموو ئەندامەکانی یەوە لە هەگبەی لاقی یان پشتی یان لمبۆزی دا.

جارێکی دیکەش دووپاتی دەکەمەوە، کە بە سەهوو چوون و ڕێ لێ وون بوونی بیردۆزە دەسکردەکان، لە پێناسە کردن و ناسینی سروشتی مرۆڤ دا، لەوەوەیە، کە لە مەودای پەتکیان پتر خۆیان ڕابسکاندوە و تێ نووساون و بە مەرەدی فسۆس پاڵەوانی چوونە، کە دەڵێن: بە هەویا بووە ئاوی دەریایە بە جامیلکەی بپێوێ !!

دەنا ئەگەر فرۆید وەك بابایەکی دەرون ناس گوتبای: من لە مەیدانی دەروون ناسی دا ئەم ڕاستی یانەم بۆ دەرکەوتوون و، داروێن وەك پسپۆڕێکی زیندەوەرزان گوتبای: لە بواری زیندەوەر زانی دا ئەم تێبینی

یانەم هاتوونە بەر چاوو..سارتەر و دورکایم و مارکس و..هتدیش هەر بەم تەرزە، ئەو دەمی هەر کامێکیان بیردۆزە و بیروڕاکانیان وەك کۆرپەیەکی نازداری بە شیری زانیاری و ئەزموون فرچك گرتوو بە سوپاسەوە لێ وەردەگیرا، بەڵام کاتێك هەر کام لەو شارەزایانە لەبەر تیشکی ئەو زانیاری و تێ بینی یانەی خۆی پێوەر و ترازوێك دروست کاو ئینسانی پێ کێشانە و پێوانە بکات، ئەوە ڕاست وەك ئەو کەسەی لێ دەقەومێ کە تەمایەتی بەس لە ڕێی دیتنەوە، پەی بە گشت خاسیەتەکانی تەنێك بەرێ، لە تام و بۆن و کێش و قەبارە و چڕی، بەڵام گومانی تێدا نیە کە خەیاڵ پڵاوی کردوە و بە مراد ناگا، چونکە هەر کام لە خاسیەتەکانی ئەو تەنە پێوەرێکی سەربەخۆی گەرەکە و ئەگەر بەردێك دوو کێلیشی پێ بکەون شەش و حەوتی بۆ ڕاناقەنێن و دەرۆستیان نایەت.

دوای تەواو بوونی ئەم قسانە یەکێك لە دانیشتوان گوتی:

_ هەرچۆنێکی بێ ڕێی تێ دەچێ فرۆید و هاو وێنانی، زەینیان ساتمەیان پێ بەرێ و هەڵ تریزێن، ئەمما مارکس قەت باوەڕ ناکەم هەڵە بکا و سەرچەنگ بچێ.

+ برادەران : پیاو درۆیە نەکات، منیش هەستم پێ دەکرد کە باسی بە هەڵەدا چوونی مارکس دەکەم، نێو چاوانتان وێك دێتەوە و دڵ و هەناوتان دەگوشرێن و ڕێك دێن، دەشزانم کە وا بەسێنایی بە مەسەلەی هەڵتریزانی مارکس ئیقناع نابن ودڵتان ئاوێ ناخواتەوە،چونکە ئێوەبەر لەوەی مارکس و بیرۆچکەکەی بناسن، خۆشتان ویستوە و لە کنیان شیرن کردوون !!

جا هەروەك گوتراوە: كە شــت زۆر خۆش ویســترا چــاو لە هەڵە و ناتەواوی یەكانی هەڵدەنگوێ". لەبەرئەوە ئەگەر مەودام بدەن برێك دەوری ماركس و ماركسیزم هەڵدێین و، ئاماژە بۆ نەختێك لە هەڵەكانی دەكەین.

_ دادەی بــا بزانیــن.

+ وەك لەمەوبەر گوتم: ماركس لە بواری ئابووری دا پسپۆڕ بووە، بەڵام هەڵ خلیسكان و سەرچەنگ چوونی وی لەوەدایە: كە ویســتوویەتی لە دەلاقەی ئابووری یەوە ولەبەر تروسكایی ئەو برە تێبینی‌یانەی لەو ڕووەوە دەسگیری بوون، مرۆڤ بقەبلێنێو[1] پەی بە گشت لایەنەكانی بەرێ، بە تەعبیرێكی دی: لەبەرئەوەی ماركس هەر لە بواری ئابووری دا پسپۆڕ بووە و خاوەنی بەرنامەیەكی هەمە لایەنەی وەك ئیسلامەتیش نەبوە، هیچ چاری نەبوە، ئەوە نەبێ كە مرۆڤ ڕێك نووشتێ و گچكەی بكاتەوە، تاوەكو لە هەگبەی گەدەی دا بحەجمێ، ئەمما كە دیقەتی گرتوە ئینسان زۆر لەوەی پۆز و زەبەلاح ترە، كە لە نێو گەدەی دا جێ ی بێتەوە، بە ناچاری لە كەچ و كرووچ كردنێی وەخۆ كەوتوە و بە تەشوێ ی ئابووریی لە كوورەی دیالكتیكی‌دا دمەزەرد كراوە و بە ئاوی سەرچاوەی داروێنیزم ئاودراوە، هەموو ئەو لایەنانەی لە هەگبەی گەدەی دا ناحەجمن قرتاندوونی و فرێی داونە سەر زبڵدانی ماتریالیزمی مێژوویی (چاك ورد بەوە).

---

(1) هەرچەندە (قەبلان) هاو واتای (نرخاندن)ەو زیاتر بۆ شمەك و كەل و پەل بەكار دێ، بەڵام بە مەبەســت (قەبلاندن)م بەكارهێنا لەباتی (نرخاندن)، بزانم دەزانی بۆچی ؟!!

هەڵوێستی مارکسم لێرەدا[2] وەك ڕەفتاری بابایەك دێتە بەر نیگا کە لە کۆشکێکی سێ چوار نهۆمی گەورە بەس تاقە ژوورێکی بەچاو دەنگێوێ و لافی دیتنی هەموو کۆشکەکەش لێ دەدات، هەر لەگەڵ پرسیاریشیان لێ کرد: ئەو کۆشکە چۆنە و چۆن نیە، دەکەوێتە تاریفی کۆشکەکە بە گوێرەی ئەو شارەزایی یەی کە لە دیتنی تاقە ژوورەکەوە وەدەستی هێناوە !!

---

(2) (میلۆڤان دوجیلاس) کە سەدەمێك ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی یوغسلافیا بوو لە پلەدا لە دوای "تیتۆ" دەهات، بەڵام دوایی بە هۆی ڕەخنە گرتنی یەوە لە مارکسیزم خرایە گرتووخانەوە و لە حیزب وەدەرێ نرا، لە کتێبێکی دا بە ناوی "کۆمەڵگایەکی ناتەواو کۆمۆنیزمی لێك هەڵوەشاو" ، لە لاپەڕە (81)دا دەڵێت:

ئەم هەڵوێستەی مارکسی یەکانم وەك هەڵوێستی (برۆکۆست) دێتە بەرچاوان، کە جەردەیەکی یۆنانی بووە و هەر کەسێکی دەگرت و ڕووتی دەکرد، دوای کوشتنی دەی خستە نێو تابووتێکەوە جا ئەگەر هاتبا و لاشەی مردووەکە قوڵەتر بایە لە ئەندازەی درێژی تابووتەکەی، ئەوە دەستی دەکرد بە تێ نووسانی و لێکی دەکێشایەوە، تا هێندەی تابووتەکەی لێ دەهات خۆ ئەگەر درێژتر بایە، ئەوە لە برینەوە و قوڵە کردنەوەی وەخۆ دەکەوت، بیردۆزەی مارکسیزمیش وەك تابووتی (برۆکۆست)ی تاین وایە، پێویستە واقیعی ژیان و سروشتی ئینسان، هەر تێیدا بحەوێتەوە جا کەیفێ خۆیەتی بە لێ کەچ کردنێ بێ، یان بە لێك کێشانەوە و لێ زیاد کردنێ، بەڵام ئەوەندە هەیە تابووتەکەی (برۆکۆست)ی گۆڕین لەبەین چووە، دەحەقەن ئەو بیردۆزە پووچەی مارکسیزمیش بە دوای دا دەڕوا و بە مەرەدی وی دەچێ. *

* تێبــینی :

دیارە ماوەی نێوان ئەو قسـەیەی بەندەو و لێك هەڵوەشانەوەی بلووکی ڕۆژهەڵات کە لەسەر بناغەی مارکسیزم بنیات نرابوو. واتە ماوەی نێوان ساڵی (1982) و (1990) تەنها هەشـت ساڵـە ! بەڵام بێگومان ئەو قسـانەی ئەوساکەی بەندەو غەیری بەندەش لە لای برادەرانی مارکسیست و کۆمۆنیست وەك خەیاڵ بڵاو دەهاتەبەرچاو ، وەك چۆن ڕەخنە و سـەرنج و تێبنی یەکانی ئێستاشمانیان لەمەڕ سیکۆلاریسم وکاپیتالیسم وگلۆباڵیزەیشـەن هەروا دێتە بەرچاو! بەڵام ئەوەی لە لای بەندە خەیاڵە لە لای خوا بەتاڵ و حەتاڵە !!(2006/3/22).

بەڵێ ماركس دەیەوێ هەگبەی بیردۆزەكەی جێی هەموو شتێكی تێداوە بێ، بێ ئاگا لەوەی "جام كە پڕ بوو دەسەری یەوە دەڕژێ" ، بێ گومان هەگبەی لەمەڕ ماركسیش (هەمبانە بۆرینە)[1]نیە، بە هیچ پڕ نەبێ و ئەگەر لە ئەندازەی خۆی زیاتری تێ كرا، لێك هەڵدەتریشێ.

هەڵبەتە ماركس لە سۆنگەی ئەوەوە كە ژیان و دیاردە كۆمەڵایەتی یەكانی لەو دەلاقەوە سەیر كردوە و بەو ترازووە لەنگ و لاتەڵە هەوڵی هەڵسەنگاندنیانی داوە، لە زۆر جێیان دا زەینی بە سەهووی بردوە و نیسكی بە گیسك و تراویلكەی بە ئاو حسێب كردوە و زۆر كەڕەتان هەڵەنگوتوە و دەكەندڕان كەوتوە، ئەمما ئێمە لە كوێ ئێستا كات و شوێن و توانا ڕێگەمان دەدات هەموان بێنینە گۆڕێ و یەك بە یەك نشتەری ژیری و زانیاری لە پۆرگی هەڵدمساوی بە بەز حسێب كراویان وەكار خەین، نەخێر مەودای ئەوەمان نیە، بۆیە تەنیا یەكێك لە نێو بیشە و چخوردی هەڵەكانی ماركس دا بە وێنە دێنینەوە:

ماركس لە قسەیەكی زۆر باویدا  كە جێی شانازی كۆمۆنیستەكانە و شوێن كەوتوانی ماركسیزم بە مایەی سەربەرزی ڕێچكەكەیانی دەزانن  دەڵێت: ئایین تریاكی گەلانە "الدین افیون الشعوب"[1] !!

---

(1) (هەمبانە بۆرینە) لە چیرۆكە ئەفسانەیی یەكان دا سەروسەودایەكی زۆری هەیە، گوایە وەك دەریای بێ بن بە هیچ پڕ نەبوە و هەموو شتێكیشی تێدا بووە.

(1) سەیری كتێبی ( اصول الفلسفة الماركسية ) بكە. ب 1 لاپەڕە 242، 243 . بكە، هەروەها بڕوانە (أسس الفلسفة الماركسية) لاپەڕە (10 ، 11)

واتە: هەروەك چۆن تریاك ئینسان بەنج دەكا و ئاگای پێ لە خۆی دەبڕێ ، ئایینیش بۆ گەلان ئاوایە و، مێشك و بیریان دەتەزێنێ و بێ هۆشیان دەكا و دەیان نوێنێ !!

جا ئێستا بەڕێزان ! با ئەم قسەیەی ماركس  كە نموونەیەكە لە تەغارێك  بە ترازووی ژیری و زانیاری هەڵسەنگێنین وڕامێنین داخوا چۆن دەردەچێ.

جارێ بەر لە هەموو شتێك ماركس لەم قسەیەیدا شێوازی عیلمیانەی ڕەچاو نەكردوە و ڕێچكەیەكی نا ماقووڵانەی گرتوە چونكە:

یەكەم: لەو مەودایە چۆتە دەرێ كە تێیدا پسپۆڕە، ئاخر لە هەموان ڕوونە كە ماركس ئابووری زان بووە، باشە بۆ دەبێ لێرەدا لە هەموو دیزان ببێتە ئەسكوێ و خۆی لە عاسێ ترین ترۆپكی فەلسەفە هەڵقورتێنێ و بچێتە سەروكاری ئەودیوی سروشت (میتافیزیكا)؟! وا دیارە ماركس ئەوەی لە بیر چوە كە نان بۆ نانەوایە و گۆشت بۆ قەساب.

دووەم: لە جوغـــزی قەڵەمڕەوی كۆمەڵگاكەی چۆتە دەرێ و دەقەمچێ كۆمەڵگا و دەوروبەرێكی وا كەوتوە بە خەونیش نەی دیوە، واتە بە دەردی كوردەكـــە گوتی: لە بەڕەی خۆی پتر لاقی ڕاكێشاون !

سێیەم: لەبەر تروسكایی ئەو برە تێ بینی و زانیارییانەدا كە لە مەڕ ئایینی شێوێنراوی (مەسیحی) هەی بووە، ویستوویەتی حوكمێكی گشتی بەسەر هەموو ئایینەكانی دنیادا بدات !

ماركس كە لە دایك و بابێكی جوولەكە وەپاش كەوتوە و لە كۆمەڵگایەكی مەسیحی دا ژیاوە، هەرچۆنێك بێ، ڕێی تێ دەچێ ڕەخنە و تێبینی خۆی سەبارەت بەو دوو ئایینە واتە (جووایەتی و دیانەتی) بخاتە ڕوو، بەڵام بە هیچ ڕەنگێك ڕەوا نیە ماركسێك كە لە ژیانیدا بێجگە لە

ناو چیدی لە ئیسلام نەزانیوە، هەر باسی بکات، چ جای ئەوەی بیداتە بەر لووزەوی تانە و تەشەران !!

ئەدی لای خۆی مارکس و مارکسییەکان لاڤی ئەوە لێ نادەن کە پەیڕەوی شێوازی زانیاری یانە دەکەن! باشە کێ هەیە بتوانێ لاملی لەوەدا بکات کە سەرەکیترین مەرجیشێوازی زانیارییانە ئەوەیە کە شارەزایی تێروتەواوت هەبێ لەو باسەی کە لـێی دەدوێی !!

مادام وابێ مارکس هەر شێوازی قسە کردنەکەشی لەم مەسەلەیەدا شێوازێکی نەزانانە و نا ماقوولانەیە، هەتا وە نێوەڕۆکی قسەکەی ڕادەگا !!

جا عارەب گوتەنی: (کیف یستقیم الظل والعود اعوج) چۆن سێبەری داری خوار ڕاست دەردەچێ ؟!

پێشینانیش بە ڕەحمەت بن لە مێژە گوتوویانە: "تاریکە شەو هەر سەر لە ئێوارێ دیارە".

ئێستا کە زانرا شێوازی قسە کردنەکەی مارکس حاڵ و باڵی چۆنە، با سەرێك لە نێوەڕۆکی قسەکەی بدەین، هەرچەندە بە دەردی شاعیرێکی فارس دەڵێ:

خشت اول چون نهاد معمار کج تا ثریا میرود بنیان کج

واتە : وەستا کە یەکەمین خشتەی خوار دانا، ئەگەر ئەو خانووە تا ئەستێرەی (کۆ) بڕوا هەر خوار دەبێ، مارکسیش مادام بنچینەی قسەکەی هەڵە و نەزانانە بوو، قسەکەشی هەروا دەبێ، چونکە کەس چاوەڕوانی

ئەوەی ناکات لە (کفر)[1]ێ کاریتە هەڵکەوێ، بەڵام بۆ ئەوەی هیچ دوو دڵی و گومانێك لەو بارەوە نەمێنێ کە مارکس ساتمەی بردوە و خراپیش کەوتوە سۆراغێکی قسەکەی هەر دەکەین:

پێشەکی: بە ڕاشکاوی دەڵێم ئەم قسەیەی مارکس سەبارەت بە ئایینی[1] دیانەکان (100/100) ڕاستە و منیش وێڕای وی دەڵێم ئایینی وا مێشك تەزێن و خەو لێ کەوێنە، چونکە:

ئایا ڕێچکەیەك :

1- بوو بێتە مایەی نەفامی و نەزانی و بەجێماوی و واز لە دنیا هێنان تریاك نیە ؟!

2- بوو بێتە هۆی پەیدابوون و فراژوو بوونی چینی سەرمایەدار و مفتە خۆر، بە بەز و غەز و زەبر و زۆر، ورگ تێر و تێر نەخۆر، لەسەر حیسابی ڕەش و ڕووت، سەربارەش قەڵس و لاڵووت، تریاك نیە ؟!

3- بە شوێن کەوتوانی بڵێ: ئافرەت لە توخم و تۆوی شەیتانە و هەتا پتر خۆی لێ دوور گرن، لە خوای مەزن نزیك ترن، جا کوڕینە نەچن ژنێ بێنن و خودا لە خۆتان بتۆرێنن، هەتا دەخۆڕا دەبینن، خۆتان لە خەڵکی دوور بگرن، بەزەیی خوا وەدەست دێنن، هەڕوونە بن

---

(1) (کاریتە لە کفرێ هەڵناکەوێ) پەندێکی پێشینانە، (کفر)یش درەختێکی باڵا نزمە و بە زۆری لە (بەست)ی چۆم و ڕووباران دا دەڕوێ و زیاتر سوودی لێ دەبینرێ بۆ پەردووی کەپر و خانووبەرە.

(1) لێرەدا مەبەست لە ئایینی دیانەتی، ئەو بەرنامە ڕێك و تەواوو بێ خەوشە نیە، کە خوای مەزن بۆ (عیسی)ی نارد ﷺ ، بەڵکو مەبەست ئەو ئەفسانە و درۆ و دەلەسانەن کە قەشە و پاپاکان بۆ سوودی خۆیان بە ناوی ئایینەوە دەگوێی خەڵکیان دەچکاندو هەردووك کێتبی (العهد القدیم) و (العهد الجدید) یان لێ پڕکردوون .

ئەشکەوتان نێو مەزاران، ڕەحمەت تان بۆ دێ بە باران..بیرێکی وا تریاك نیە ؟!

4- وا هەژار و نەدار و برسی یەکان حاڵی کات و تێ بگەیەنێ، کە هەتا دنیا دنیایە و زەوی لە سەر پشتێ گایە، ئاغا و مسکێنی هەر بوە و هەر دەشمێنێ، هەر کەسێکیش خەتەرەی وای بە دڵی دا بێ کە نابێ گوزەران وابێ، هەم لە دنیایەش ڕیسوایە، هەم خواش لە خۆی دەڕەنجێنێ.. بیرێکی وا بەنج کەر نیە؟!!

5- وە لە کۆتایی دا  هەرچەندە ئەفسانەکانی کڵێسای بە ناو ئایین دوایی یان درەنگ دێ  ئایا ڕێچکەیەك ڕدێن سپی و پێشەوایەکانی ببنە سەرباری کۆمەڵ و لە میللەت ببنە ملۆزم و خۆیان بکەنە دەمڕاست و کوێخای خودا و بە پێی ئارەزوو بەرژەوەندی یەکانی خۆیان پڕوپاگەندە و قسەی بێ ڕێ و جێ بڵاو کردنەوە زەین تەزێن و تریاك نیە[1] ؟! با ئۆباڵ بەستۆم.

...لێرەدا شتێکم لەم بارەوە هاتەوە بیر:

دەگێڕنەوە لە سەدەکانی نێوەڕاست دا یەکێك لە پێشەوایانی کڵێسا، بەهەشتی بە خەڵکی دەفرۆشت، بۆ وێنە یەکێك دەهاتە لای و دەیگوت:

قوربان بەندە دەیەوێ (100م2)ی موڵکی بەهەشتیم پێ بفرۆشن، ئەویش پێی دەگوت: دە هەستە بڕۆ (100) لیرەی سوورم بۆ بێنە و بە گەردنئازایی دەقەبەڵمی بکە، نەوەك خوانەخواستە حەڕام بێ !!

(1) بە ڕاستی جێی داخە، کە بەشێك لەو ئەفسانە کڵێسایی یانە، لە ئەنجامی کەمتەرخەمی و بێ ئاگایی و تەماعکاری هەندێك لە مەلا و شێخەکان، وەك گیاکەڵەیەکی پیس خۆیان خزاندۆتە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی یەوە و، لە هەمووشی دڵتەزێن تر ئەوەیە کە هەندێك هەرزەکار و نیمچە ڕووناك بیر ئەو شتانە بە زادەی ئیسلام دەزانن، بەڵام بێگومان وانیە و دەبێ بڵێین : هەر کەس نیە لەماڵم ئاگای نیە لە حاڵم .

بابایەکی دەوڵەمەندی فامیدە و ژیریش، دەیەوێ گەل لە چەنگی ئەو دین فرۆشە دڵ نەخۆشە بێ هۆش و گۆشە بێ پەرۆشە ڕزگار کات، دەچێتە لای و پێی دەڵێ: قوربان دەمەوێ دۆزەخت لێ بکڕم، ئەمما نەك بە مەتر و گەزو شتی وا، بەڵکو ئەگەر ڕێك کەوین ، تێکڕا هەمووت لە گۆترە لێ دەکڕم، کابرای پێشەوای دین فرۆش، هەرچەندە زۆری پێ سەیر دەبێ و لە ئاقار ڕەفتاری کابرای دۆزەخ کڕدا سەری سوڕ دەمێنێ، بەڵام پێشینان گوتوویانە: **"تەماع هێند شیرنە گەروێ دەگرێ"**، بەڵێ دوای برێك هەڵدا و پێدا کردن ڕێك دەکەون و سەر لەبەری دۆزەخێ دەبێتە ئی کابرای دەوڵەمەند و لە ژێر ڕکێفی بابای دین فرۆش دەردەچێ !!

ئینجا کابرای دۆزەخ کڕ بە نێو خەڵکی دا ڕای دەگەیەنێ کە لە مەودوا هیچ کەس حەوجێی بەوەی نیە بەهەشتێ بکڕێ، چونکە دۆزەخ عایدی منە و نایەڵم کەس پێی تێ نێ !

(هەڵبەتە مادام ڕێی چوونە دۆزەخیش بەسترابێ چوونە بەهەشت مسۆگەرە و منەتی کەسی تێدا نیە) !.

بەڵێ کاکە گیان:

ئەوەی کە مارکس بە ناوی ئایین و بەرنامەی خوایی یەوە دیتوویەتی ئاوا بووە، ڕێچکەیەك بوە کە پارەدار و ستەمکار و تەماعکاران دوای تالاَن و بڕۆ و شێلانی نەدار و بێ دەرەتانان، دەچوونە کن بابایەکی ئاوا دین فرۆش و پسوولە (بطاقة) ی لێ خۆش بوون (صکوك الغفران) یان لێ وەردەگرت و ئیدی وەك نە بایان دیبێ نە باران، پشتێنیان لێ دەکردەوە.

وە ڕێچکەیەك بوە بە هەموو شێوەیەك نەدار و ڕەش و ڕووتەکانی دەچەوساندەوە و لە گۆشت و خوێنی شان و پیل و پشت و بازووی وانی

دەبڕی و دەی خستە سەر بەز و غەزی گەدە و گیپاڵ و چۆڵەمە و نێوشانی بابای چەوسێنەرەوە و موڵك دار.

جا توخوا ڕێچکەیەکی ئاوا، بێجگە لە تریاك دەبێ چ بێ؟!

ئەمن یەکەباریێ خۆم، دەڵێم: ڕێچکەیەکی وا، تریاکی گەلانە و ئەگەر شتێکی دیکەشم شك بردبا لە تریاکی بەدتر دەم خستە سەرێ !!

بەڵام وەك گوتمان، مارکس لەم قسەیەی دا بەس ڕێچکەی کلێسای مەبەست نەبوە، بەڵکو تێکڕای ئایینەکانی وەبەرداوە و هیچ کامیانی هەڵنەبواردوە[1].

مادام وابێ ئیسلامەتیش وەبەر ئەم حوکمەی مارکس دەکەوێ، چونکە لە ڕوانگەی مارکسەوە، ئیسلامیش وەك هەر کام لە ئایینەکانی دیکەیە و هیچی لەوان زیاتر نیە.

بەڵام ئایا قسەی مارکس سەبارەت بە ئیسلامیش ڕاست دەردەچێ ؟!!

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە با چاوێك بە دەقەکانی قورئان و سووننەت دا بگێڕین، چونکە دوو تاقە سەرچاوە ڕوونە بنەڕەتی یەکەی ئیسلامن.

یەکەم: ئایا ئیسلامێك کە دەڵێ: **﴿ وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴾ الاسراء** 36.

وە دوای شتێك مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نیە، وە دەڵێ: **﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾ فاطر** 28. بە ڕاستی بەس بەندە زاناکان خواناس و لە خوا ترسن.

(1) واتە تێکڕای ئەوانەی بە ئایین ناو دەبرێن، ئیدی چاو پۆشی لەوە بکە داخوا کامەیان ئایینە و لە کن خوا جێی ڕێزە، کامەشیان یان کاتی خۆی ئایین بوە بۆ گەل و تیرە و قۆناغێکی تایبەتی و دوایی گۆڕراوە و شێوێنراوە، یان هەر لە بنچینەدا ئایین نەبوە و، بە ناوی ئایینەوە ساز کراوە.

وه دەڵێت "طلب العلم فريضة على كل مسـلم" (رواه أحمد) گەڕان بە دوای زانیاری دا لەسەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە،وه دەڵێت: ﴿ وقل رب زدني علما﴾ طه -114- بڵێ پەروەردگارم شارەزایی و زانیاریم زیاد کە.

وه ئیسلامێك کە یەکەمین ئایەتی قورئانەکەی دەڵێ : ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ العلق(1-2) بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەت کە بەدیهێنەرە .

وه ئیسلامێك کە سوێند دەخوا بە قەڵەم و مەرەکەب و نوسین ﴿ ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴾ القلم 1-2،

وه ئیسلامێك کە لە قورئانەکەی دا زیاتر لە (750) کەڕەت وشەی زانیاری[1] دووبارە کراوەتەوە، وه لە (50) شوێن .

---

(1) هەرچەندە لە ئاڵقەی دووەمی ئەم زنجیرەیەدا ، ماوەیەك نووکی خامەمان بە دەوری ئەم مەسەلەیەدا هێناوە و بردوە و سەلماندوومانە کە بەرنامەی خودا، ئەوپەڕی ڕێزی لە زانیاری گرتووە بە هەموو ڕێ یەك ئینسانی هەڵناوە بۆ زانیاری بوون و ناسینی دیاردە سروشتی یەکان، بەڵام لێرەش دا یەکی دیکە لە گەوهەرە بە شۆق و گرانبایی یەکانی قورئان دەخەینە سەر سینی زمانی کوردی و بۆ خوێنەری ئازیزی کوردی ڕادەنوێنین، بەشکم ئەوە خوایە دەوروبەری ئەم مەسەلەیە  کە بۆتە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری هەندێك فریودراوو کۆلکە خوێندەواران  هێندە ڕووناك بێتەوە کە بە هیچ ڕەنگێك مەودا بە شەمشەمە کوێرەی کوێرەڕێ و بیردۆزە ئەفسانەیی یەکان نەدات چیدی حەشارگە و پەنا و پەسیوی تێدا بەدی بکەن و چیدی بەچکە شەیتانەکان زەمینەی ئەم مەسەلەیە نەکەنە سپێری خۆیان.

ئەو گەوهەرەش دەتوانین ئاوای ڕای نوێنین:

ئەگەر بێت و چاوپۆشی لە هەموو شتێك بکەین و هەر سەرنجێکی ناوی سوورەتەکانی قورئانی مەزن بدەین. گرنگی دانی ئیسلام بە زانیاریمان بۆ دەردەکەوێ، ئێستاش فەرموون لەگەڵ ناوی ژمارەیەك لەو سوورەتانەی کە ناوی هەر کامێکیان بریتی یە لە دیاردەیەکی ئەم سروشتە:

| ناوی سوورەت | ماناکەی |
|---|---|
| 1. البقرة | مانگا، چێڵ |

| | |
|---|---|
| 2. النساء | ئافرەتان |
| 3. المائدة | خوان، سفرە |
| 4. الانعام | ئاژەڵ، حوشتر، مانگا، مەڕ، بزن. |
| 5. الرعد | هەورە تریشقە، برووسکە. |
| 6. النحل | هەنگ، مێشە نگوینە. |
| 7. الكهف | ئەشكەوت. |
| 8. النور | تیشك، ڕووناكی |
| 9. النمل | مێروولـە. |
| 10. العنكبوت | جاڵجاڵووكە. |
| 11. الزخرف | زێڕو زیـو. |
| 12. الدخان | دووكەڵ، گاز. |
| 13. الاحقاف | تەپۆلـكە، گردۆلكە. |
| 14. الذاريات | بایە ڕەپێچەك دەرەكان. |
| 15. الطور | كێوی تور. |
| 16. النجم | ئەستێرە |
| 17. الحديد | ئاسن |
| 18. القمر | مانگ |
| 19. الشمس | ڕۆژ، خۆر |
| 20. القلم | خامە، قەڵـەم |
| 21. الانسان | ئینسان، مرۆڤ |
| 22. الليل | شەو، شەوگار |
| 23. البروج | ئەستێرە زلـەكان، قۆناغەكانی ڕۆژ یا مانگ. |
| 24. الفجر | بەرەبەیان، سپێدە. |
| 25. العلق | خوێن پارە، قۆناغی دووەمی كۆرپە لـە نێو منداڵ دان دا. |
| 26. البلد | نیشتمان، وڵات. |
| 27. الضحى | چێشتە نگاو. |
| 28. التين | هەنجیر. |

زیاتر داوای لە مرۆڤ کردبێ  لە قورئانیدا  کە بیر بکاتەوە و بفامێ و سەرنج بدا و ڕامێنێ و ورد بێتەوە و لێ بکۆڵێتەوە و ژیری بخاتە کار، ڕەوایە بە تریاك و مێشك تەزێن و زەین بەنج کەر لە قەڵەم درێ ؟!!!

دووەم: ئایا ئاینێك دژی سەرمایەداری بێ وەك خوای مەزن دەفەرموێ :

﴿.... هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ البقرة 29

واتە: خواوەند هەرچی کە لە زەویدا هەیە بۆ هەموانتانی خولقاندوە. وە هەڕەشە لە بابایەك بکات کە لە ژیانی دا هەر سەرگەرمی ماڵ وەسەرێك نان و پارە ژماردنە، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ (1) الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ (2) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ (3) كَلاَ لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ﴾ الهمزة 1 تا 4

وە ئیسلامێك دوژمنی هەرە سەرسەختی ئەوانە بێ، کە منداڵی بێ باب و دایك و مرۆڤی بێ پەنا داڵدە نادەن و مشووریان ناخۆن

﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ(1) فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ(2)وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ الماعون 1 تا 3

وە ئیسلامێك ڕزگار بوون لە دۆزەخ ببەستێتەوە بە تێکۆشان لە پێناوی دابین کردنی ئازادی سیاسی و ئازادی ئابووری بۆ هەموو کەس

---

| | |
|---|---|
| 29. العصر | چاخ، ڕۆژگار. |
| 30. الفيل | فیل. |
| 31. الزلزلة | بوومە لەرزە. |
| 32. العاديات | ئەسپی شۆڕشگێڕ و جەنگاوەران. |
| 33. الماعون | پێداویستی یەکانی ژیان. |
| 34. الناس | مەردوم، خەڵك. |

﴿ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (12) فَكُّ رَقَبَةٍ (13) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ..﴾ **البــــلد**[1]

ئیسلامێکی وا کفر و بێ ویژدانی نیه، تۆمەتی تریاك بوونی وەپاڵ بدرێ؟!!

سێیەم: ئایا ئیسلامێك هێندە بە تەنگ ئاوەدانی یەوە بێ، بۆ ئاوەدانی و کارو کاسبی و فەراهەم هێنانی ژیار و پێش کەوتن، پێغەمبەرەکەی ﷺ دەستی گرێ گرێ بوو و قەڵش قەڵشی بابایەکی کاسب و ئیش کار ماچ کاو بڵێت: ((**انها يد يحبها الله ورسوله**)). ئەمە دەستێکە خودا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێ، وە بڵێ: بازرگانی ڕاستگۆو ڕاست ڕەفتار لەگەڵ شەهیدان و پیاو چاکان دا حەشری دەکرێ[1]، وە بڵێ: موسڵمانی خاوەن پیشە خۆشەویستی خودایە، وە بڵێ: خوا کاری ڕێك وپێك و وردەکاری پێ چاکە و حەز لە ئیش وکاری بێ سەرەو بەرەو لام سەللایی ناکات. ئیسلامێکی وا کێ زات دەکا و دەخۆی ڕادەبینێ بە تریاك و زەین تەزێنی حسێب کات؟!!

چوارەم: ئیسلامێك ئەوەندەی دادگەری و یەکسانی تێدا بێ، پاشایەك و گەدایەك بە یەك چاو سەیر کاو، لە دادگادا پێکەوە ڕایان گرێ[2]، وە بە

---

(1) لە ئەڵقەکانی دیکەدا، بە تایبەتی لە یەکەم و پێنجەم دا ڕاڤە کراون.

(1) بۆ دەقی عارەبی ئەم سێ فەرمایشتە تەماشای ئاڵقەی دووەمی ئەم زنجیرەیە بکە. لاپەڕە ( ) .

(2) ئاماژەیە بۆ ڕووداوەکەی (جیبیللەی کوڕی ئەیهەم) ، کە یەکێك بوو لە پاشاکان و لە کاتی فەرمانڕەوایەتی عومەری کوڕی خەتتاب دا موسڵمان بوو، بەڵام ڕۆژێکی لە دەمی سووڕانەوە (طواف) ی بە دەوری کەعبەدا، کابرایەکی دەشتەکی لاقی لە کراسەکەی ئاڵقاو ئازاری پێ گەیشت، جیبیللەش هەتا هێزی تێدا بوو زللەیەکی لە کابرا داو لووتی شکاند، کابراش لە کن عومەر سکاڵای کرد و، عومەر جیبیللەی بانگ کرد بۆ دادگا و پێی گوت: یان دەبێ کابرای لووت شکاو ڕازی کەی یان دەبێ لووتی بۆ ڕاگری هەمان جۆرە زللەت لێدات، جیبیللە مۆڵەتی خواست کە شەوێ بیری لێ بکاتەوە، بەڵام شەوێ هەڵات و قوتار بوو !!

ڕاددەیەك بە خەم ئازادی سیاسی و بیروڕا دەربڕینەوە بێ، کە پیرەژنێکی سادە بتوانێ ڕەخنە لە سەرۆکی دەوڵەت بگرێ و لە دەمی وتار خوێندنەوەدا قسەکەی پێ ببڕێ و پڕ بە زاری پێی بڵێ: نەخێر قسەکەت تەواو نیە و بە هەڵەدا چووی ! ئەویش بێ هیچ جۆرە خۆ پۆز کردنێك زۆر بە ساکاری بڵێ: ڕاست دەکەی بە هەڵەدا چوو بووم[1]، ئیسلامێکی وا چۆن ژیری و زانیاری ڕێ بە ئینسان دەدەن پێی بڵێ تریاکی گەلانە و بێ هۆشیان دەکات !!

بەڵێ ئایا ئیسلامێك بە دان پێداهێنانی زانا بێگانەکان[2] بوو بێتە هۆی مەزن ترین شۆڕش و گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکانی: کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و پەروەردە و فێر کردن و پیشەسازی و زانیاری و ئەدەب و ڕەوشت و ئاکاری بەرز و ..هتددا دەگونجێ هەروا بە سێنایی بە تریاکی حسێب کەین و مۆری ئەفسانەی پێوە نێین ؟!!

ئەوە سەبارەت بە دەقەکانی ئیسلام ، ئێستاش با چاوێك بە مێژووی ئیسلامی دا بگێڕین، تا بزانین مارکس ڕاست دەکات ئیسلام دەوری تریاکی دیوە لە ژیانی گەلان دا یان بە پێچەوانەوە:

یەکەم: هەر کەسێك نەختێك ئاگادار بێ لە حاڵ و گوزەرانی نەتەوەی عارەب بەر لە هاتنی ئیسلام و ئەو ئاڵ و گۆڕ و گۆڕانەی کە بەسەریان دا هاتن دوای باوەڕ هێنانیان بە ئیسلام، هێندەی سەرە دەرزییەکیش گومان و خەتەرەی دە دڵی دا نامێنێ سەبارەت بە مەزنی و تێر و تەواوی ئیسلام، بۆ وێنە:

---

(1) کە پیرەژنەیەك لە مەسەلەی مارەیی دا ڕەخنەی لە عومەری کوڕی خەتتاب گرت.

(2) هەندێك لەو دان پێداهێنانانە لە ئاڵقەی دووەم دا خراونە ڕوو.

(1)نەتەوەی عارەب پێش هاتنی ئیسلام بریتی بوو لە چەند تیرە و هۆزێکی پرژ و بڵاوو دابڕ دابڕ کە هەمیشە سەرگەرمی لێکدان و پێکدادان و یەکدی ڕووتاندنەوە بوون، تەنانەت زاراوەی (نەتەوەی عارەب) لە فەرهەنگی مێشکی ئەوسای ئەو تیرە و هۆزانەدا، هەر نەبوو !!

(2)عارەبەکان بەر لە موسڵمان بوونیان دواکەوتوو ترین و بێ سەرەو بەرە ترین گەلی سەر زەوی بوون لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە:

لە لایەنی سیاسی یەوە  وەك گوتمان  بریتی بوون لە چەند تیرەیەکی وێك هەڵنەکەر و دابڕ دابڕ.

لە لایەنی ئابووری یەوە ، چینایەتی و قڕی و پڕی لەو پەڕی دابوو، ڕاستە و ڕاست ڕژێمی دەریایان بەسەردا چەسپی بوو کە دەڵێ : ماسی گەورە ئی گچکە قووت دەدا.

لە لایەنی فیکری و ڕۆشنبیری یەوە، بە دەگمەن یەکێکت چەنگ دەکەوت کە خوێندن و نووسین بزانێ، تەنانەت قورئان ناوی ناون نەخوێنـــــــدەوار (أمـي)[1] وەك دەفەرموێ:﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ ﴾ الجمعة 2

واتە: ئەو خودایەی کە لە نێو نەخوێندەواران دا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردن. ئەوە هەمووی لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە لە هەموان

---

(1) وشەی (أمیّ) هەرچەندە مانای نەخوێندەواریش دەگەیەنێ، بەلام لە ئایەتەکەدا مەبەستی پێ ئەو گەل و میللەتانەیە کە شارەزایی یان بە کتێبەکانی خوا سبحانە و تعالی نەبووە، واتە (غیر کتابي) بوو ون، بەڵگەشم لەو بارەوە هەن بەلام لێرەدا دەرفەتی خستنە ڕوویانم نیە و لە زنجیرە وانەی : (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری کۆتایی محمـد ﷺ دا ئاماژەم بۆ کردوون ، کە خوا یاربێ لە داهاتوودا دەکرێنە کتێب و چاپ دەکرێن ، (3/22 / 2006)

ڕوونە کە عارەبەکان تێکڕا بت پەرست بوون و کڕنووشیان بۆو بتە داتاشراوانە دەبرد، کە بە دەستی خۆیان لە دار و بەرد و خورما دروستیان دەکردن! جا دەبێ بە جێماوی و دواکەوتوویی فیکری لەمە زیاتر چ بێ ؟!!

لە لایەنی کۆمەڵایەتیشەوە، بە جارێکی شیرازەی کۆمەڵ پچڕا بوو، هەندێك سەرمایەدار و ئەشراف و چەوسێنەر زۆربەش نەدار و پەك کەوتەو زەبوون و بەشخوراو ، ڕەوشت و خووی بەرز و پەسند مەگەر چۆنەکایی دەنا باری کردبوو، شەڕاب خۆری و داوێن پیسی و قومار و بێ شەرمی درووشمی هەرە زەقیان بوو، ئافرەت زۆر بە چاوێکی سووك سەیر دەکرا و لە زۆربەی ئەو مافە سروشتی یانە بێ بەش بوو کە خوا بۆی بڕیار داوە و، وەك کۆیلە وابوو لەبەر دەستی پیاودا، جا ئەوەندە بەس نیە بۆ سەلماندنی ستەم لێ کراوی و چەوسێنرانەوەی ئافرەت کە ڕێی نەدرێ گەورەبێ و هەر بە گچکەیی زیندە بە چاڵ بکری؟!!

(3) گەلی عارەب بەر لە موسڵمان بوونی، وەك شتێکی بێ ئەمیەت و کەم بایەخ لە قوژبنێکی ئەم جیهانەدا خۆی ڕێك هێنابوو کەس نەی دەهێنایە نێو حیسابان و، بە دەردی کورد دەڵێ: کەس پێی نەدەگوت خەڵکی کوێی[1] !!

---

(1) گومانی تێدا نیە کە هەندێك عارەبی نا موسڵمان و ڕەگەز پەرست و ئەبو جەهلیی بەم قسانە کێچیان دەکەوێتە کەوڵی و قەڵس دەبن، چونکە ئەوان پێیان وایە کە عارەب بەهۆی ئیسلامەوە چاك نەبوە و بەر لە ئیسلامیش هەروا بوە! تەنانەت ئی وایان تێدایە دەڵێ : ئیسلام کەلەپورێکی نەتەوەیی عارەبە و لە نێو عارەب دا هەڵقوڵیوە !

بەڵام ئەم جۆرە قسانە وێڕای پووچەڵی یان، سەرچاوەی هەڵقوڵێنەریشیان ئاشکرایە.

بەڵێ برایان ئەمە حاڵ و گوزەرانی عارەبان بوو، بەر لە هاتنی ئیسلام و گەردن کەچ کردنیان بۆ بەرنامەی خوا، بەڵام با ئەمجار سەرنج دەین داخوا دوای موسڵمان بوونیان چیان بەسەرهات، با بزانین داخوا تریاکی ئیسلام چۆنی بەنج کردوون ؟:

(1)ئیسلام بەر لە هەموو شتێك دە نەتەوەی عارەبی ▯ وە لە هەموو نەتەوەکانی دیکەشی ▯ گەیاند، کە بێجگە لە خوای باڵا دەست، هەروەك چۆن کەس لە دروست کردنی مرۆڤ دا دەستی نەبوە، نابێ کەسیش بەندایەتی و گەردن کەچی بۆ بکرێ و لە بەرنامە دانان بۆ مرۆڤ دا دەستی هەبێ، کەواتە هەموو ئەو بتانەی دەپەرسترێن لە دار و بەرد و شەیتان و مانگ و ڕۆژ و فریشتە و تاغووت و دیکتاتۆر، پێویستە وەلانرێن و لە جێی وان دا خواوەندی بەخشندە دابنرێ. بەڵێ ویردی زمانی پێغەمبەر (محمد) ﷺ

((**قولوا لا اله الا الله تفلحوا**))رواه احمد بوو،

واتە: "بڵێن بێجگە لە خودا هیچ پەرستراوی دیکە نین سەرفراز دەبن".

(2)پێغەمبەر ﷺ بە فەرمانی خودا ڕای گەیاند کە هەموو مرۆڤەکان یەکسانن و کەسیان ئیمتیازی بەسەر کەسیان دا نیە، چونکە هەموویان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە

---

تێبینی :

مەبەستم بەم قسانە حیزبی بەعسی شۆڤێنی بوو،بە تایبەت دامەزرێنەرەکەی (میشیل عەفلەق) کە پێغەمبەری خوای ﷺ بە بلیمەت (عبقریە)ێکی عەرەب ناودەبرد! ئاشکراشە کە کاتی خۆی ئەو قسانەی بەندە زۆر خەتەر بوون، چونکە ڕژێمی گۆڕ بە گۆڕی بەعس هیچ جۆرە ڕەخنەو سەرنج و بگرە هیچ جۆرە بیر (فکر)ێکی نەیاری قبووڵ نەدەکرد !

**((كلكم بنوا آدم و آدم خلق من تراب))** [1] .

كەواتە : ڕژێمی کۆیلەدار و کۆیلەیی و ئەشراف و ڕەشۆکی و ئاغا و مسکێنی، ڕژێمێکی پووچ و گەندەڵە و پێویستە فڕێ درێتە زبڵدانی مێژووەوە.

(3)دیسان پێغەمبەر ﷺ ، بۆی ڕوون کردنەوە کە ئافرەتیش وەك پیاو ئینسانە و لە مرۆڤایەتی دا یەکسانن و شتاقیان ئیمتیازیان بەسەر ئەوی دیکەدا نیە، ژن و مێردیش تەواوکەری یەکدین و کەسیان کۆیلەی ئەوی دیکەیان نین، جیاوازی یەکیش کە لە نێوان ئەرکی پیاو و ئافرەتدا هەبێ  لە بەرنامەی خوادا  لەبەر ئەوەیە کە پیاو پیاوە و ئافرەتیش ئافرەت، واتە: هەرکامێکیان خاوەنی سروشت و کەسایەتی یەکی جوێیە لەوی دیکە چ لەلایەنی جەستەیی یەوەو چ لەلایەنی فیکری یەوەو چ لە لایەنی نەفسـی یەوە، چونکە خواوەند هەر کامێکیانی بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکێك ساز کردوە، کە تایبەتە بەخۆیەوە و بەوی دیکەیان جێبەجێ ناکرێ.

بەڵێ ئیسلام بۆ یەکەمین جار ئافرەتی هێنایە ڕیزی پیاوو فەرمووی:

**﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾** النحل 97

واتە: هەر کەسێك کردەوەی چاك بکا لە نێر یان مێ، بە مەرجێك بڕوادار بێ، لە دنیادا ژیانێکی چاك و بەلەزەتی بە قسمەت دەکەین  چونکە

---

(1) ئەم فەرمایشتە (حذيفة) گێڕاویەتەوە، بڕوانە کتێبی (الجامع الصغير) بەرگی دووەم ژمارە (6388).

ژیانی مسـولْمانانه یەکجـــار خۆش و بەلەزەتە  وە لە دوا ڕۆژدا پاداشـتیان دەدەینەوە بە پاداشـتی چاکترین کردەوەیان.

بەڵێ : ئەو پیاوانەی کەبەر لە ئیسلام بەشتێکی زۆر کەم بایەخ و سووک سەیری ئافرەتیان دەکرد، ئیسلام وای لێ کردن کە لە کاروباریان دا پرس و ڕا لە ژنەکانیان وەرگرن و ڕاوێژیان پێ بکەن، وە ئەو ئافرەتانە کە وەك کۆیلە وابوون لەبەر دەستی مێردیان دا، وایان لێ هات خاوەنی ویست و ئیرادەی خۆیان بن و ئەگەر هەستیش بە ستەم لێکراوی بکەن بچنە لای پێغەمبەر ﷺ یان قاضي و سکاڵای خۆیان ڕا بگەیەنن.

بەڵێ ئیسلام بە ڕاستی ئافرەتی کردە مرۆڤێکی خاوەن ئیرادە و ئازاد لە چوار چێوەی یاساکانی ئیسلام دا، نەك وەك ئافرەتە بەستەزمانەکانی بن سێبەری ڕژێمی کافر، کە کراونە کۆیلە و ئامراز و بووکە شووشەی پێ ڕابواردن، لە بەرگی ساختەی سەربەستی و ئازادی بێ نێوەڕۆك دا.

(4) ئیسلام وای لەو عارەبە نەخوێندەوار و زەین کوێر و تاریك بیرانە کرد، کە ببنە هەڵگری مەشخەڵی خوێندن و نووسین و ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونـــەر و ببنـــە بنیـــاتنەری شـــێوازی لێکۆڵینەوەی زانستیانە و ئەزموونیـــــانە و، ببنە سازدەری گەورەترین و دەوڵەمەندترین و دادگەرترین دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر زەوی، وە ئیسلام بوو بە هۆی ئەوەی کە بەو عارەبە نەفام و سادانە گەورەترین شارستانەتی دروست کات، کە هەتا دنیا دنیایە هەر شارستانیەتی یەك دروست بێ قەرزدار و منەت باری ئەو شارستانەتی یە ئیسلامی یەیە[1].

---

(1) تەماشای ئەڵقەی دووەم بکە ، بزانە چۆن زانا بێگانەکان باسی ئیسلام دەکەن.

(5)ئیسلام وای لەو عارەبە ڕەوشت نزم و ئاکار دزێوو بێ سەرەو بەرانە کرد، کە ببنە ڕابەر و پێشەوای مرۆڤایەتی، لەڕەوشت و جوانی و ئاکار پەسندی دا، بەڵێ هەر کەسێك چاوێك بە ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەردا  خوا لێیان ڕازی بێ  بگێڕێ بێجگە لە: ڕاست گۆیی‌وهەقپەرستی‌و چاکە دۆستی و بە ئەمەگی و نەرم و نیانی و ئارام گری و زمان پاکی و داوێن پاکی و دڵپاکی و ڕەفتار چاکی چیدی وەبەر چاو نایەت، بەڵام ڕەنگە هەر کام لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ بەر لە موسڵمان بوونی دڕندەیەکی سەربەخۆ بووبێ!

ڕەوشت جوانی و ئاکار پەسندی عارەبە موسڵمانەکان بە ڕاددەیەك بووە چووبانە هەر وڵاتێك خەڵکی بەر لەوەی گوێیان لە وتاریان بێ، شەیدا و هۆگری ڕەفتار و کردار و ئاکاری موسڵمانانەیان دەبوون !

(6)هەر ئیســـلام بوو، کە عارەبی کردنە نەتـــەوەیەکی سەربەخۆ و، هەر ئیســـــلامیش بوو کە ناوی عارەبی لەسەر ڕووپـــەڕەکانی مێـــژووی مرۆڤایەتی تۆمار کرد و لە بێ ئەمیەتی و کەم بایەخی ڕزگاری کردن و بە جیهانی ناساندن .

جا نازانم ئیسلامێك ئەو هەموو ئاڵ و گۆڕ و گۆڕانکاری یە پەسندەی بەسەر ژیانی گەلێکی وەك (عارەب)دا هێنابێ، چۆن ڕەوایە، بە قسەی بابایەکی جوولەکەی داخ لە دڵ بە تریاکی لە قەڵەم بدەین !!

دووەم: یان وادیارە ئیسلام بۆ گەلی کورد تریاك بووە و مێشکی پێی بەنج کراوە و لە خشتە براوە !

دادەی وەرن با سەرنجێکی خێرا لە گەلی کورد بدەین، بەر لە موسڵمان بوونی و دوای موسڵمان بوونی :

لە هەمووان ڕوونە کە بەر لە هاتنی ئیسلام گەلی کورد هیچ جۆرە ناوونیشانێکی لە جیهان دانەبووە، چونکە بەشی لای ڕۆژئاوای لە ژێر نیری ئیمپڕاتۆری ڕۆمی دابوە و، بەشی ڕۆژهەلاتیشی لە ژێر ڕکێفی ئیمپڕاتۆری فارسی دا ، هەڵبەتە لە سۆنگەی ئەو ژێر چەپۆکی یەشەوە بوە، کە کورد نە دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەبوە، نە ئەدەب و زمانێکی دیار و بەرچاو.

بەلام دوای ئەوەی کوردیش وەك دەیان گەل و نەتەوەی دیکە هاتنە بن باڵی ئیسلام و گەردن کەچی پەیڕەوی خودایی بوون، دەبینین شان بە شانی گەلانی دیکەی جیهان، قۆڵی مەردایەتی یان لێ هەڵماڵیوە و لە خزمەت کردن بەو ئیسلامەی کە ڕزگاری کردون و کردوونیە گەلێکی سەربەخۆ و ئازاد و خواناس، وە خۆ کەوتوون ، بەو جۆرە دەیان ئینسانی شارەزا و بلیمەت و لێهاتوو لە گەلی کورد لە ژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامی دا لە قوتابخانەی قورئان دا پێ گەیون، کە لە هەموو بوارەکانی ژیان دا خزمەتیان بە ئیسلام کردوە و، خزمەت گوزاری و لێهاتوویی ئەو گەلە کوردە نەبەردەیان بۆ دنیا ئیسپات کردوە.

بەڵێ گەلی کوردی ئازیزمان  خوا سەربەرزی دنیا و دوا ڕۆژی کا و لە ڕێچکەی شەیتانی بە دوور کا  ڕۆڵەی وەك: (صلاح الدين) ی ئەییوبی پەروەردە کرد، کە توانی لێشاوی بە لووزەوی سوپا و قۆشەنی خاچ پەرستان پاشەکشە پێ بکاو،ڕووی جیهانی ئیسلامی سپی وەکاو (قودسی) پیرۆز ڕزگار کاو سوپای دوژمن بەرباد کا، ئەو (صلاح الدين)ەی کە توانی دەوڵەتێکی ئیسلامی دامەزرێنێ بە ناوی دەوڵەتی ئەییوبی کە توانی زیاتر لە سەدەیەك خۆی ڕاگرێ و هەموو سەرۆکە کانیشی ڕۆڵەی کورد بوون.

هەروەها گەلی کوردمان لە ژێر سێبەری دەوڵەتی قورئان دا مێژووزانی وەك : "ابن الاثیر" و گەڕیدە (سیاح)ی وەك: "ابن خلکان" و فەرمایشت ناس (محِّدث) ی وەك : "ابن صلاح الشهرزوري" و ڕێزمان (نحو و صرف) زانی وەك : "ابن الحاجب" و شاعیری وەك: "بابا طاهر" و "احمد شوقي" و "مولوي" و "احمدي خاني" و نووسەری وەك "ابو الفداء" و "ابن المستوفي" و "بیتوشي" و شۆڕش گێڕی وەك: "سەعیدی نەوڕەسی" و زانا و خواناس و صۆفی وەك: "مولانا خالد" و "کاك ئەحمەدی شێخ"ی بەرهەم هێناوە، کە هەر کامێکیان تەن بە تەن جێی شانازی و سەربەرزی گەلی کوردن، چ جای هەموویان وێکڕا.

بەڵێ برایان: ئەمەش  بە کورتی  حاڵ و گوزەرانی گەلی کورد بوو، بەر لە ئیسلام و دوای هاتنی ئیسلام،جا نازانم ئەو مێشك بەنج کردن و بیرو زەین کوێر کردنەوەی گەلان بەهۆی ئیسلامەوە کەنگێ و لە کوێ دا ڕووی داوە !!

قسەم لەوەی نیە، کە دوژمنانی ئیسلام بارودۆخی ئێستای گەلەکەمان  کە بە هۆی لە ئیسلام دوورکەتنەوەیەوە، هەتا بڵێی بێ سەرە و بەرەو شێواوە  بە تاوانی ئیسلامی بزانن !!

بەڵام ئەوانەی وا بیر دەکەنەوە با سوور بزانن کە ئەم قسەیەشیان بەڵگەیەکی دیکەیە، بۆ سەلماندنی سادە و بیـر کورتی و نەفامییان.

کەواتە برایان: لەمەوە کە ڕابرد ڕوون بۆوە کە ئیسلام نەك هەر تریاك و مێشك تەزێن نیە، وەك مارکس دەڵێ، بەڵکو هاندەر و وریا کەرەوەی گەلانە.

جا ئێستا كه زانرا و ساغ بۆوه ماركس و ماركسیزم له ئیسلام به تریاك حسێب كردن دا ساتمەیان بردوه و سەرچەنگ چوون، با ڕامێنین و ورد بینەوه، بزانین هۆی ئەو هەڵەنگوتن و لەپەو ڕووكەوتنه چیه؟!

ئەگەر له بیرتان بێ، ماوەیەك لەمەوبەر له كاتێك دا خەریكی توێژینەوەی شێوازی نەزانانه و نا عیلمیانەی ماركس بوین، له سێ خاڵان دا ئەو مەسەلەیەمان خسته ڕوو، ئێستاش كه دەربارەی هۆی بەهەڵەدا چوونی ماركس دەدوێین حەوجێی ئەوان سێ خاڵانین و خاڵێكی چوارەمیشیان ڕەگەڵ دێخین، كەواته بەهەڵەدا چوونی ماركس له به تریاك حسێب كردنی ئیسلام دا ، سەرجەم دەگەڕێتەوه بۆ چوار شتان:

یەكەم: چوونه دەرەوەی ماركس له مەودای پسپۆڕی یەكەی، كورد گوتەنی: له هەموو دیزان بۆته ئەسكوێ.

دووەم: قسه كردنی سەبارەت به كۆمەڵگایەك كه به خەونیش نەی دیوه، وەك پێشینان دەڵێن: تفەنگی به تاریكایی یەوه ناوه.

سێیەم: تاوانبار كردنی ئیسلام ، لەبەر تروسكایی ئەو تێبینی یانەدا كه لەمەڕ دام ودەزگای كلێسا دەدوێن، كورد گوتەنی: هەموو سمێڵ سوور به هەمزاغا زانیــن.

چوارەم: كێشانی هەموو شتێك به سەنگ و ترازووی ئابووری ، واته: هەر له هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردن.

لەمەوبەر دەربارەی سێ خاڵان دواین، ئێستاش تاوێك دەچینه سەروكاری خاڵی چوارەم:

ئایا ماركس ڕاست دەكات كه ئابووری سەرچاوه و بنەچــەكەی ژیانی مرۆڤـه به هــەموو شــتێكی یەوه؟!

لە مێژە گوێتان ڕاگرتوە دەترسم سەرتان بێشێنم بۆیە بە وێنە هێنانەوەیەکی ساکار وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە:

ئایا جوتیاری کورد هەروەك چۆن  ئەگەر دەخۆی ڕابینێ  بە گژ بابایەکی ئاغا[1] و دەرەبەگ دا دەچێت، کە هەویای زەوت کردنی زەوی و زارەکەی وی هەیە و دەیەوێ قووتی منداڵانی ببڕێ، بە هەمان شێوە و بگرە توندتریش بەرۆك و ژێر چەنەی ئەو ماتریالیست و بێ دینە ناگرێ، کە لە ڕاست ئایین و موقەددەساتی دا زمانی بە خراپ دەگەڕێ و پێی خوار دادەنێ !!؟

دە باشە ئەوە لە مەسەلەی زەوتکرانی زەوی و زارەکەی دا ئابووری و[2] بەرژەوەندی ماددی لە گۆڕێدا بوە و بۆتە پاڵنەری جوتیارەکە بۆ شۆڕش کردن و وەدەنگ هاتن، بەڵام لە مەسەلەی دووەم دا چی؟!!!

---

(1) لێرەدا مەبەستم لە (ئاغا و دەرەبەگ) کەسێکە کە بە زوڵم و دەستدرێژی و بە شێوەیەکی ناشەرعی دەستی بەسەر زەوی و زارێکی زۆردا گرتوە و خۆی بەسەردا سەپاندوە و پاشان ئەو جوتیارانەی زەوییەکەی بۆ دەکەنە کشت و کاڵ کردوونی بە نیوەکار و بەربۆتە خوێنمژین و چەوساندنەوەیان، کە پێم وایە ئەو حاڵەتە ئێستا لە کوردستان یان نەماوە یان زۆر دەگمەنە، کەواتە باوا نەزانرێ کە هەموو (ئاغا) و شۆڕت ئاغایەکم مەبەستە. چۆن ئێستا کەسانی وا هەن نازناو و لەقەبی ئاغایان هەیە و هەژار و نەداریشن یان دەوڵەمەند و بە خزمەت و چاکەکارن !!

(2) هەرچەندە لە دوایین پەراوێزی وتووێژی دووەم دا لە ژێر سەرباسی (بەرکولێك دەربارەی ماتریالیزمی مێژوویی)دا ، تا ڕاددەیەکی چاك نشتەری ژیری و زانیاریمان لەم مەسەلەیە وەکار خستوە و، دەمامکمان لەسەر ڕووی دز لابردوە، بەڵام بە پەسندی دەزانم برێکی دیش تیشکی هەق و ڕاستی بخەینە سەر شەوە زەنگی ئەم قسە پووچە، کە بە بڕبڕەی پشتی مارکسیزم دا دەنرێ، تاکو بۆ هەموان ڕوون بێتەوە کە ئەوەی بۆتە مۆدێلی تازە بابەتی، برێك هەرزەکار و گەنجی نیوە خوێندەواری گەلی کورد و ناویان لێناوە "فەلسەفەی مارکسیزم" ، ئەگەر پێی گوترابا: "ئەفسانەی مارکسیزم" زۆر ناوێکی ماقووڵ تر و گونجاو تر بوو:

یەکەم: لە سروشتی ئینسان د ، وێڕای غەریزەی گەدە پڕ کردن و بەرگ دەبەر کردن و ماڵ وەسەرێك نان، کە ئابووری پێك دێنن ، گەلێك غەریزەی دیکەش هەن، کە بارتەقای ئابووری و بگرە زیاتریش کار دەکەنە سەر ژیانی و دەبنە هاندەر و بزوێنەری ، لەو غەریزانە:

(1) غەریزەی جینسی:

هیچ کەس نیە بتوانێ ئینکاری کاریگەری و بنچینەیی ئەم غەریزەیە بکات، تەنانەت چەندین بەسەرهات و ڕووداوی دڵتەزێن لە مێژووی هەر نەتەوەیەك دا هەن کە نێوەرۆکەکانیان بریتین لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و فیداکاری پیاوو ئافرەتێك لە پێناوی یەکدی دا.

(2) غەریزەی سەرۆکایەتی و خۆ دەرخستن: (غريزة الزعامة و حب الظهور) .

ئەمیش غەریزەیەکی بنەڕەتی و بە تاوو تەئسیرە و، زۆر جاران وارێ کەوتوە و ڕێش دەکەوێ بۆ گەیشتن بە سەرۆکایەتی و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی مرۆڤ چاوپۆشی لە ئابووری و بابی ئابووریش کردوە و دەکات.

(3) غەریزەی شت فێر بوون و پەی بردن بە نهێنی یەکان: (غريزة التعلم والاطلاع) بێ گومان هەر کامێکمان دیتوویەتی، یان لانی کەم بیستوویەتی کە مرۆڤی وا هەیە لە دەمی سەرقاڵی و سەرگەرم بوونی دا بە زانیاری و لێکۆڵینەوەوە، هەموو شتێکی لەبیر چۆتەوە، کەســانێکیش کە لە پێناوی تەسەل کردنی ئەم غەریزەیەدا ماڵ و دارایی بگرە  هەندێك جاران  پۆشاك و بەرگیشیان بەخت کردوە لە هەموو چاخ و سەردەمێك دا هەبوون و هەن.

(4) غەریزەی بەرەو کامڵی چوون: (غريزة حب التكامل) .

وەك نەفس پاك کردنەوە لە خوو خدە بەدەکان و ڕازاندنەوەی بە ڕەوشتو ئاکاری جوان و دڵگیر و پەسند کە لە ڕێبازی سۆفیایەتی (تصوف)دا زاراوەی (تخلية و تحلية) ی بۆ ڕۆنراوە، بێ گومان ئەمەش غەریزەیەکی سروشتی و ڕیشەدار و کاریگەرە، زۆر کەسیش لە پێناوی تێر کردنی ئەم غەریزەیەدا چاو دەپۆشن لە دنیا و هەرچی تێیدایە.

(5) غەریزەی خواپەرستی و ئایین دۆستی: (فطرة التدين)

ئەم غەریزەیە کە من بە قەستی وەدوام خست، بنج و بنەڕەتێکی یەکجار قووڵ و ڕۆچووی هەیە لە سروشتی مرۆڤ دا، کوردیش گوتەنی: ڕۆژ حەوجێی ئاماژە بۆ کردنێ نیە، بەڵام ئێمە لەم بارەوە سەرنجی خوێنەر تەنیا بۆ یەك بەڵگەی سادە و ساکار ڕادەکێشین: ئێستا کە سەدەی بیستەمە و شارستانەتی ماددی لەوپەڕی تەوژم و تین دایە، دەبینین ، زیاتر لە (5/4) ی خەڵکی دنیا بە شێوەیەك لە شێوەکانی پەرستن  ڕاست بێ یان هەڵە  خوا دەپەرستن و ئایین و بیروباوەڕێکی میتافیزیکییان هەیە، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە زانا و شارەزایانی شوێنەوارزان (علماء الآثار) دەڵێن: لەوەتی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە دەژی بە شێوەیەکی گشتی خودای پەرستوە و ئایینێکی هەر هەبووە، و ئاشکراشە کە لە هەموو چاخ و سەردەمێك دا

ئایا چ بەرژەوەندی یەکی ئابووری لەوەدایە کە بابای جوتیار لەسەر ئایینەکەی وەدەنگ بێ و خۆی لەسەر مەفع کاتەوە، لە کاتێك دا بە چاوی خراپ سەیر دەکرێ و قسەی بەدی پێ دەگوترێ ؟!!

---

کۆمەڵێکی وا هەر هەبوون کە لە پێناوی خوا و بەرنامەکەی دا خەبات بکەن و تەنانەت گیانیشیان لێ وەچاو نەبێ لەو ڕێیەدا.

دووەم: هەر کەسێك مێژووی ژیانی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) بە گشتی و پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بە تایبەتی موتالا بکات، هێندەی نووکی دەرزییەش دوو دڵی و دڵ لە دڵ دانی نامێنێ، لە وەدا کە جگە لە خۆشەویستی خودا و ترسی جەزرەبە و سزای دوا ڕۆژ، هیچ شتێکی دیکە نەبۆتە هاندەر و پاڵنەرێك لە ڕاگەیاندن و چەسپاندنی حوکم و بەرنامەی خوادا.

چونکە دەبینین ئەو زاتە مەزنانە دوای ئەوەی خوا وەسەری خستوون و بوونە دەسەڵات دار و فەرمانڕەوا، هیچ جۆرە گۆڕانێك بەسەر جۆری ژیان و گوزەرانیان دا نەهاتوە و وەك سادەترین ئینسان بە دنیا نەویستی و خواپەرستی و بێ تەماعی ژیانیان بەرێ کردوە.

جا باشە ئەگەر مارکسیزم درۆ ناکات لەوەدا کە ئابووری و بەرژەوەندی ماددی تاقە بزوێنەری مرۆڤە، ئەدی چما ئەو زاتە گەورانە دوای سەرکەوتنیان ، هەر جارێك ئاوڕێکیان لەو ئامانجە نەدایەوە کە بە درێژایی تەمەنیان لە پێناوی دا ڕەنجیان کێشاوە ؟!!

سێیەم: هەر کەسێکی بە ویژدان، لە ژیانی بڕوادارانی ڕاستەقینە بە تایبەتی برادەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەرمان ﷺ (خوایان لـێی رازی بێ) ورد بێتەوەو، ئەو هەموو لە خۆبوردوویی و ڕەنج و فیداکاری یەیان ببینێ کە لە پێناوی خوادا کردوویانە، وەك مانگی چواردە بۆی دەردەکەوێ کە مارکس و هەرچی وەك ویش بیروەکا بەراوەژوو حاڵی بوە.

ئایا ئابووری و بەرژەوەندی دنیایی پاڵی بە: ئەبوبەکری صدیق و عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و خالیدی کوڕی وەلید و موصعەبی کوڕی عومەیر و عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهلەوە نا کە بڕوا بە ئیسلام بێنن و ماڵ و گیانی لە ڕێدا دانێن ؟!

ئایا هەر کام لەمانە بەر لە مسـوڵمان بوونی ساماندار و خۆش گوزەران نەبوە ! ئەدی چ شتێك وای لـێکردن کە مارکس و مارکسیزم وەدرۆ بخەنەوە و واز لە ئابووری و بازرگانی و بەرژەوەندی دنیایی و خۆش گوزەرانی بێنن و دەست دەنە ئاڵای ئیسلامێك کە لەو کاتەدا هەموو دنیای کوفر و بێ بڕوایی وەك گورگێکی برسی زاری لێ داپچڕی بوو هیچ کەس بەتەما گیانی خۆشی نەبوو هەتا وەشتی دی ڕا دەگا ؟!!

بەڵێ برایان تەفسیر کردنی ژیانی مرۆڤ لەسەر بنچینەیەکی ماددی ڕووت وێڕای ئەوەی کە لە نرخی مرۆڤ دا دەشکێنێ قسەیەکی ژیرانە و عیلمیانەش نیە.

داوا لە بیردۆزەی مارکسیزم دەکەین زاری نەبێتە تەڵەی تەقیوو وەڵام بداتەوە !!

جا ئێستا نازانم داخوا لەگەڵ ئەم هەڵە زەق و ڕەتەڵ بردنەش دا برادەرانی مارکسی هەر سوورن لەسەر ئەوە کە مارکس زاتێکی تێروتەواوو بێ لەکەیە و فەیلەسووفی دەورانە یان نا؟!

مامۆستاکەیان کە لە وتووێژی دووەمیش دا هاوبەشی کردبو، بە تووڕەیی و ڕەنگێکی سوور هەڵگەڕاوەوە گوتی:

_ کاکە تۆ خەریکی چی؟ ئێرە جێی ئەو جۆرە باسانە نیە !!

+ بۆچی برا گیان، خۆ هیچی خراپ و لەگەڵ واقیع دا نەگونجاوم نەگوتوە.

_ تۆ کە باسی ئیسلامەتی دەکەی پێت وایە ئێمە موسڵمان نین.

+ دە مادام وایە ، بۆ نارەحەت دەبن و خۆتان قەڵس دەکەن، مادام ئێوەش (الحمد لله) موسڵمانن، دەبو لە باتی نێوچاوان تێك نان و پۆز بوون، دڵتان بکرێتەوە و ئارامیتان بۆ بێ.

_ ئێستا لە کورتی بی بڕێنەوە، قایل نیم لێرەدا ئەم تەرزە باسانە بکەیەوە ئێرە (بارەگایە ) نەك مزگەوت !

+ ئاخر بۆچی برادەر ؟!!

_ چونکە ئەم برادەرانە (دەستی بۆ کۆڕەکە ڕاکێشا) زۆربەیان لەم قسانە حاڵی نابن و تەقەیان لەسەری دێ.

دوو سێ یەکیان گوتیان: کوڕە بۆ تێ ناگەین، وەڵڵا باوکم زۆر چاك تێدەگەین و، زۆریش حەز لەم جۆرە باسانە دەکەین.

+ برادەران بە بڕوای من ئەم جۆرە باسانە شتێکی یەکجار پێویستن، چونکە پەیوەندییان بە ژیان و چارەنووسی مرۆڤەوە هەیە، مەسەلەی حاڵی نەبوونی بڕێك لە برادەرانیش لەم ڕێ یەدا نابێتە کۆسپ و چەپەر، چونکە ئێمە هەر کەسێك توانای تێ گەیشتنی نەبوو وێڵی کەین بە بەهانەی

ئەوەی کە تێ ناگات، ئەو کەسە هەتا هەتایە لە گێژاوی بێ ئاگایی دا دەمێنێتەوە، هەڵبەتە ئەمەش شتێکی ڕەوا نیە.

لێرەدا یەکێکیان هەستا کوڕەکەی بەجێ هێشت و گوتی:

_ پەککو ! شەرت بێ ئەوەی شەش دانە مانگی ڕەبەقە خەریکی فێر بوونمی هەمووم لە بیر چۆوە !

ئەمنیش لەبەر خۆمەوە گوتم: ئاخر شەش مانگی ڕەبەقە بیری پووچ و ئەفسانەیی یان دە مێشکی ئاخنیوی، بەڵام لەم دانیشتنەدا ڕاستی و هەقت کەوتە بەر گوێ و پڕوپاڵانتە و شتە بێ نێوەڕۆك و قرپۆکەکانی نێو مێشکت، وەك شەمشەمە کوێرە لە کاتی هەڵهاتنی ڕۆژێدا، خۆیان قوتار کرد و هەڵاتن.

بەهەر حاڵ جارێکی دیکەش مامۆستاکەیان گوتی:

_ کاکە تکایە ئەم جۆرە قسانە لێرەدا مەکە، ئەم مەسەلانە فەلسەفی و قووڵن و دانیشتنی پشوو درێژیان گەرەکە.

**+ بەڵام ئەمن پێم وایە هەر بیروباوەڕێکی ڕاست و تەواو، پێویستە گەلی پێ ئاشنا بکرێ و بۆی ڕوون بکرێتەوە، ئیدی کەیفێ خۆیەتی قووڵە یان تەنکە، هەر کەسێکیش بلێ بۆیە بیروباوەڕەکەم ناخەمە ڕوو، قووڵە و تێی ناگەن، یان گومانی خراپی بە گەلەکەی بردوە،یان ئەوەتا بیرەکەی قرپۆك و پووچەڵە و لەوەی دەترسێ بە خستنە ڕووی شەرمەزار بێ و ئابڕووی بچێ.**

**بێ گومان بە درێژایی ئەم وتووێژە ، زۆربەی دانیشتوان زۆر بە بایەخ پێ دانەوە گوێیان ڕاگرتبوو ، بە سەرسامی یەوە بە دەریای بیر کردنەوەدا چوو بوونە خوارێ و پێیان سەیر و عاجباتی بوو، کە ئەو ئایینە تریاکە و ئەو ئیسلامە کۆنەپەرستـــت و ڕەجعی یەی ، هەتا دوێنێ مامۆستـــا و دەمڕاستــــەکانیان، تۆمەتی ئەفسـانەیـــی و دواکەوتوویـــی و بە کەڵك**

**نەهاتوویی‌یان دەدایە پاڵ، ئێستا هەر هەمان مامۆستا و قسە بە دەست و دەمڕاست بەس هێندەیان   پێ دەکرێ بڵێن:**

**کاکە بێ دەنگ بە :**

**ڕازی نین لێرەدا ئەم قسانە بکەی !**

**کاکە ئێرە جێی ئەم جۆرە قسانە نیە !**

**کاکە ئێمەش موسڵمانین !**

**باشە هەیاران ! ئەگەر ڕاستە ئیسلام ئەفسانەیە و ، ئایین تریاکی گەلانە و، موسڵمانان ڕەجعی و کۆنەپەرست و دواکەوتوون، بۆ دەبێ مامۆستا و ڕدێن سپی و دەمڕاستەکانمان، بە خستنە ڕووی قەڵس بن !**

**بۆ دەبێ هەراسان و نا سەرسەنگ بن ؟.!**

**ئەگەر ڕاستە ئیسلام و خواپەرستی ئەوەیە کە ئەوان دەیلێن، دەبوو لە باتی قەڵس بوون و نێو چاوان تێك نان، گەلێك گەلێکیان پێ خۆش بێ و** سوپاسی ئەو کەسەیەش بکەن کە ئیسلامێکی ئاوا بخاتە ڕوو، بۆ خاتری وەی گەل بیناسێ و لە هەڵە و ناتەواوی‌یەکانی بگات و لێـی وەپرینگێ !

بەڵام نەء ! وا دیارە لەو دیوی پەردەوە شتێك هەیە و، کورد گوتەنی:

ئەم ماستە بێ موو نیە !!

بەهەر حاڵ کەرەتێکی دیکەش بە دەنگێکی تووڕە ترو بە ڕەنگێکی چرژاو ترەوە، مامۆستاکەیان گوتیەوە و دوو سێ‌یەکیش پشتگیری یان کرد!

_ کاکە گوێت لێ بێ ! لەمەودوا بە هیچ ڕەنگێك ڕازی نیم ئەم جۆرە قسانە بکەی، وا دیارە نازانی لە کوێ دانیشتووی !!

پێشینان گووتوویانە: هەموو شتێك بە خوێ، خوێیش بە مانا، دیسان گوتراوە: جام کە پڕ بوو دەسەری‌یەوە دەڕژێ، کاتێك ئەوان هێندە بە

شێوازێکی ناقۆلاَ و نالەبار، دوو جار و سێ جار دەنگیان دام منیش دڵم گەرم بوو، بۆیە گوتم:

+ برادەرانی مارکسی! ئەمەیە سۆشیالیستی عیلمـــــــی و فەلســـەفە دیالکتیکی یەکەتان ! توخوا ئەمەیە ئەو بیرە زانیاری و پێشکەوتنخوازەی کە بە دیاری بۆ گەلی کوردی موسڵمانتان هێناوە.

کە ناوێرن و زات ناکەن لە ئاقار ئیسلامێك دا بیخەنە ڕوو کە بە تریاکی گەلان و تانە و لەمپەری سەر ڕێی کاروانی شارستانەتی دەزانن ؟!

ئەگەر ڕاستە قەناعەتی تەواوتان بە ڕاستی و تەواوی بیردۆزەکەتان هەیە، بۆچی لە خستنە ڕووی دەترسێن و دەسڵەمنەوە، مرۆڤ کاتێك هەست بە ڕاست و دروستی ڕێبازەکەی دەکات بە هیچ کلۆجێك لە ڕووبەڕوو پێکردنی لەگەڵ بیرۆزە و بەرنامەکانی دیکەدا باکی نیە.

ئەمن یەکەبارێ خۆم کە ئایینی ئیسلام بە ڕێباز و بەرنامەیەکی تێر و تەواو دەزانم، ئامادەم لەگەڵ هەر بیروباوەڕێکی دیکەدا بەرانبەری پێ بکەم، لەسەرکەوتن و زاڵ بوونیشی بێ خەم و پشت ئەستوور و دڵنیام.

_ برا گیان ئاخر ئێمە نامانەوێ نەتەوەکەمان بەهۆی وتووێژی ئیسلامیانە و مارکسیزمانە، ڕیزەکانی تێك بچن و پەرتەوازە بێ.

+ باشە باش، هەڵبەتە پاراستنی یەکیەتی و تەبایی گەل ئامانجێکی سەرەکی و بەرزی هەموانە، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانرێ کە گەل تەنیا کاتێك یەکپارچە و تەبا و لە با دەبێت کە بیروباوەڕێکی وا هەبێت بتوانێ هەموو ئەندامانی ئەو گەلە لەسەر یەك زەمینە کۆ بکاتەوە و، یەك ئامانجیان بۆ دیاری بکات، جا بە بڕوای ئێمەی موسڵمان، بەس ئیسلامەتی توانای ئەوەی هەیە و غەیری ئیسلام  هەرچی بێ  دەبێتە هۆی پارچە پارچە

کردنی گەل و تێك بەردانی ڕۆڵەکانی  وەك دیتوومانە و ئێستاش دەی بینین [1].

## لە کۆتایــی دا پێــم گوتن

+ لە ڕاستی دا ئێمە ئامانجمان یەکە، ئەو ئامانجەش بریتی‌یە لە حەساندنەوەی گەل و چارە کردنی گیروگرفتەکانی، بەڵام ئێوە لە ڕوانگەی مارکسیزمەوە لە مەسەلەکە دەڕوانن، کە بە بڕوای ئێمە مارکسیزم سەربارەی ئەوەی کە **بیردۆزەیەکی هەڵە و ناتەواو و دژ بە ژیری و زانیاری‌یە، لەگەڵ بارودۆخی فیکری و نەفسی گەلەکەشمان دا ناگونجێ و دارخورما چەند لەسەر شاخی قەندیل شین دەبێ و دەڕوێ مارکسیزمیش هەر هێندە لە نێو کوردەواری‌دا دەچەسپێ.**

**وە ئێمەی موسڵمانیش لە ڕوانگەی ئیسلامی ئازیز و پەیڕەوی خوای پەروەردگارەوە تەماشای ئەو مەسەلەیە دەکەین.**

**بەڵام برایان بەر لەوەی لێتان جوێ وەبم، دەمەوێ لە ڕاستی‌یەك ئاگادار بن: زۆر باش بزانن کە نیشتیمان پەروەر و گەل پەروەری ڕاستەقینە بەس مرۆڤی خواناس و موسڵمانە، چونکە هەر ئینسانی خواناسە کە لە ترس و سامی سزای بە ئازاری دوا ڕۆژ و شەرمەزاری ڕۆژی مەحشەر، لە ناپاکی و خیانەت دوورە پەرێز بێ و، لەسەر حیسابی گەلی ڕەش و ڕووت و چەوساوە**

---

(1) دیارە ئەوەی مارکسیستەکانی دوێنێ و سیکۆلاریست و لیبرالیستەکانی ئەمڕۆ بە یەکدییان کرد، کەس بە کەسی نەکردووە، کە بە حیساب هەموشیان تاکە ئامانجیان هەر کورد و کوردستان بوو! دیارە ئێستاش لەگەڵ بێ ستەمدیدەیی کوردستان هەر باجدانی ئەو شەڕ و گێچەڵ و فەرتەنانەیە کە ئەو برادەرە دڵسۆز و بەپەرۆشانە لەسەر کەوڵی گەل و وڵاتەکەیان نایاننەوە، هەر بەردەوامە و هەر خواش دەزانێ هەتاکەی درێژە دەکێشێ !! (2006 /3/22).

**نەکەوێتە ڕابواردن و ورگ تێر کردن و گیرفان پڕ کردن[1] ، بەڵێ بێجگە لە مرۆڤی خواناس و موسڵمان هیچ کەس جێی دڵنیایی نیەکە بەیانی خوێن و ئارەقی نەتەوەکەی نافرۆشێ و بە کۆشك و تەلار و ترومبێلّ و پلاّوو گۆشتی نادات، چونکە ئینسانی نا موسڵمان پێی وایە ژیان هەر ئەم** ژیانەیە و بەرزترین ئاوات و هیوای بابایەکی ماتریالیست و بێ بڕواش خۆش گوزەرانی و بە لەزەت لەوەڕانە.

بەڵێ برایان بە ڕاستی ئینسانێك نەی توانیبێ نەفسی خۆی لە چەنگ شەیتان و هەواو ئارەزووی قوتار کات، قەت قەت تێی ڕا نادیترێ خەڵکی ڕزگار کاو، هەر کاتێکیش بۆی لوا هیچ دوور نیە و گەلێك گەلێك چاوەڕوان کراوە کە لەبەر خۆی و ئەو بەرژەوەندی یە ماددییانەی لە ژیانیدا کردوونیە ئامانج، کەسی لە بیر نەمێنێ و، ژیانی بکاتە لەوەڕگا و کلکێی تێدا ڕاوەشێنێ.

## ئەنجامی ئەم وتوویــژە

(1) دیارە ئێســتاکە ساڵی (2006)ە دیاردەی ڕابواردن وورگ تێرکردن و گیرفان بگرە قاسە و بانق- پڕکردنی ئەو جۆرە برادەرانە یان ڕاستر بڵـێیـن زۆربەی هەرەزۆریان  بۆتە ڕاستییەکی ڕوون و حاشـا هەڵنەگر و ئەوەی ئەو کاتە بەندە پێشـبینی (توقـع)م کردبوو ڕێك و ڕاست دەرچووە ! جا لـە هەموویشی سەیرتر ئەوەیە کە ئەو برادەرانە ڕازیش نین خەڵك و جەماوەری ڕەش و ڕووت لـە هەموو شت کەم بۆ هەموو شــت ئاتاج. گلـەییشیان لـێ بکات و ڕەخنەشیان لـێبگرێ خۆیان بە شـتی پیـرۆز (مقدّس) یش دەزانن و خەیاڵیشـیان وایە هەتا سـالاّنێکی زۆریش هەر ئاوا دنیایان بۆ تەخت و هەموار بێت !! بەڵام من دیســان پێشـبینی (توقع) دەکەم کە ئەم وەزعەیان عومری کورت و کەم خایەن بێ !

دوو سێ ڕۆژ دوای ئەم وتووێژە ، وا هەڵسووڕا من و سێ چوارێك لەو برادەرانە کە یەکێکیان پلە و پایەکی بەرزی هەبوو، بەرەو دێی (ق) ڕێمان گرتە بەر، بەڵام هەر هێندەمان خۆش بوو تا تۆزێك وەدوور کەوتین، دەست و برد هەورە پرژوبڵاوەکان لێك وەنزیك کەوتن و سەریان پێکەوە ناو، وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر باران دەستی بە ڕێژنە و لینگێزەی لێکدا لێکدا کرد، ڕێ و بان سەر لەبەر بوونە جلێتاوو لێزماو، سەرتان نەیەشێنم هەتا ڕێ بە نیوەیی بوو، هیچ کاممان پنووی ئیشکمان نەمابوو .

دوای ئەوەی ماوەیەکی دیکەش ڕۆیشتین و هەستم کرد کە نزیك کەوتووینەوە لە قسە بە دەستەکەیانم پرسی:

+ ئەرێ زۆری ماوە بگەینە جێ ؟!

_ بۆچی ؟!

+ گوتم ئەگەر بزانم وە نوێژێ ئێوارێ ڕاناگەم چیدی پێی نەوەخرێ و لێرە بیکەم.

_ چی چی ! چۆن بەم حاڵەش دەتەوێ نوێژێکت نەچێ !

+ جا بۆ کاکە ئەم حاڵەمان چیەتی ؟!

_ چۆن چیەتی ! کاکە با پێت بڵێم: ئەمڕۆ زۆرم خاتری تۆ گرتوە و دڵم ڕاگرتووی، دەنا هەزار کفرم دەکرد، ئەمە کوا گوزەرانە ؟!

+ سەبارەت بەوە کە وەك دەڵێی ، ویستووتە دڵم ڕاگری و هەستم بریندار نەکەی، بۆیە زمانی خۆت لە کفر کردن گێڕاوەتەوە، پڕ بە دڵ سوپاست دەکەم، بەڵام ئەگەر لەبەرت گران نەبێ پرسیارێکم هەیە.

_ فەرموو !

+ بە بڕوای من کفر کردنی تۆ شتێکی نا ماقووڵە، چونکە تۆ بڕوات بە خوای مەزن نیە تاکو نە قایلی خۆتی بەرانبەر دەربڕی ، پێم ناڵێی چ شتێك وات لێ دەکات کفران بکەی ؟!

لێرەدا چۆمیلکەیەکمان تووش بوو، باقڵ وەڵامی پرسیارەکەم ، دەوێ دا خنکا، بەهەر حاڵ بڕێکی دیکەش ڕۆیشتین و، دوای چەند قسەیەکی ئاسایی دەمڕاستەکەیان گووتی:

_ باشە پێم ناڵێی چیت لە نوێژ کردنیدا دیتۆتەوە، وا هێندە لەسەری سامەرەستووی ؟!!

+ نوێژ وەك هەموو دەستوورێکی دیکەی ئیسلامی لە دوو ڕووەوە پێویستە، یەکەم: چونکە ئەرکێکی بەندایەتیە بەرانبەر بە خودا، ئینسان بە نە کردنی سپڵە و بێ نمەك دەردەچێ.

دووەم: وێڕای ئەمەش، دەمە زەرد کردنەوەیەکی یەکجار پێویستە بۆ تیغی ئیرادەی کول بوو، بە بڕینی ئاستەنگ و لەمپەری سەر ڕێگای ژین، بە تەعبیرێکی میکانیکی یانە: نوێژ و خواپەرستی بۆ ئینسان وەك (شحن) بارگاوی کردنەوەی پاتری وایە بۆ ئۆتۆمبێل.

دەفەرموو هەڵوێستی من و تۆ لە ئاقار ئەم بارودۆخەدا چەند جیاوازیەکی گەورەیان هەیە، ئەمن بە دڵێکی پڕ لە ئارامی و بڕواوە، ڕووبەڕووی دەبم و دەزانم کە هەرچی لە ژیان دا دێتە ڕێی ئینسان خێر و چاکەیە، بـــــە مەرجێك موسڵمان بێ، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ ﷺ :

(( **عجباً لأمر المؤمن ان أمره كله له خير، و ليس ذلك الا للمؤمن، ان أصابته سراء شكر فكان خيرا له، وان اصابته ضراء صبر فكان خيراً له** )) رواه مسلم.

واتە: " ئیشی ئینسانی بڕوادار سەیرە، چونکە هەر چۆنێکی بێ هەر خێرو چاکەیە، ئەوەش بۆ کەس نیە بێجگە لە بڕوادار، ئەگەر خۆشی یەکی تووش بوو سوپاسی خوای دەکا، ئەوە بۆی بە خێر و پاداشت دەنووسرێ، وە ئەگەر ناخۆشی یەکی تووش بوو ئارام دەگرێ دیسان بۆی بە خێر و پاداشت حسێب دەکرێ".

بەڵام تۆ دەبینم سەری دنیایەت لێ وێك هاتۆتەوە و پێت وایە، لە بن دارێکی هیچ گەڵای پێوە نیە و خەریکی لەگەڵ ئەو خوا مەزنەش دا بکەویە گێچەڵ نانەوە و دەعوا، کە بۆ خۆت دەڵێی بڕوام پێی نیە، جا برای ئازیز مادام بڕوات پێی نیە پێم ناڵێی چۆن گڕنەی تێ داڵێنی ؟!

_ بەهەر حاڵ ئەگەر سێ ڕۆژی دیکەش بۆم بە ئایین هەڵا بڵێی هەر بە ئەفسانە و تریاکی دەزانم.

+ بەڵام قسەی بێ بەڵگە، وەك پارەی قەڵبە و کەس وەری ناگرێ !

_ بەڵگە و مەڵگەی چی ! شتەکە ئاشکرا و ڕوونە.

+ باشە ئەگەر ڕاست دەکەی ئاشکراوڕوونە کوا ؟ ئەدی بۆچی لەبەردەم وتووێژی عیلمیانەدا زارتان بوو بو بە تەڵەی تەقیوو خوا خواتان بو قوتار بن ؟!!

_ تاقەتی ئەو جۆرە باسانەم نیە و ئیسلامیش‌هەر ئەفسانەیە و بە نە سەلماندنی تۆ وەڕاست ناگەڕێ.

+ برادەر ئەگەر هەر شەڕە قسە بێ، ئەمنیش زار و زمانم هەن و، هەتا تۆ جارێك بە ئیسلام دەڵێی ئەفسانە، من دە جار بە بیردۆزە نەزۆك و قرپۆکەکەی تۆ دەڵێم ئەفسانە، ئەمما من لەگەڵ گوتنیش دا ئامادەم بە بەڵگەی ژیرانە و عیلمیانە بۆت ئیسپات بکەم.

_ دەزانی ئەم جۆرە قسانەت بەرەو ئاکامێکی خراپ و دڵتەزێنت دەبەن !

+ (بە پێکەنینەوە گوتم چۆن ؟)

_ بەهەر حاڵ ، دەڵێم بەردەوام بوونت لەسەر ئەم تەرزە بیرە و ئەم چەشنە قسانە، تووشی زەرەر و زیانت دەکەن، دوایی نەڵێی پێتان نەگوتم، ئۆباڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت.

+ برادەر تۆزێك گوێ ڕادێرە تاکو چەمك و مەبەستی قازانج و زەرەرانت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ ڕوون بکەمەوە، وا دیارە بێ هەواڵی ! قازانج و سوودی ئینسانی موسڵمان هەمیشە لە پابەند بوونی دایە بە بەرنامەی خواوە، جا بریا ئەو پابەندی و ئیلتیزامەی سەری دەکێشا بۆ تێدا چوونیشی، زەرەر و زیانیشی لە هەتلەیی و لاملی دایە لە بەرنامەی خودا، پێشم سەیرە کە دەتەوێ بە شتێك بم ترسێنی کە مرۆڤی خواناس و بڕوادار ، بە ئاواتی هەرە بەرزی دەزانێ و بە دوای دا عەودالە، براکەم[1] بزانە: کە ئینسانی موسڵمان لەو دەمەی دا کە لە ڕێی خواو بەرنامەی خوادا تووشی ناخۆشی دەبێ  کە ئێوە بە زیانی دەزانن  لە هەموو دەمێ زیاتر دڵی ڕەحەت و ئاسوودەیە.

_ جا باشە ئەوە دامنا ئیسلام ڕاست و تەواویش بوو، خۆ تۆ بە تەنێ هیچت لە دەست نایەت، دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر نزیکەی دوو سەعات باسی ئیسلامت کرد، بەڵام بێجگە لە کاك (--) کەس نەهاتە سەر قسەکانت.

+ تو خوا بە ڕاست کاك (--) دوای من قەناعەتی هێنا بوو ؟!

_ ئائا پشتگیری لە قسەکانی تۆ دەکرد و ، دەیگوت: ئیسلام ڕاست و تەواوە و ئێمە تا ئێستا تێی نەگەیشتووین.

+ ئایا دەزانی ئەم هەواڵەی کە ئێستا پێت ڕاگەیاندم و من ئاگام لێ نەبوو، پتەوترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئیسلام و پووچەڵی مارکسیزم ؟!

---

(1) واتە برای نەژادیی و نەتەوەیی وەك پێشتر لە وتووێژی یەکەم دا ڕوونم کردەوە.

_ چۆن ؟!!

+ بەڵێ من نزیکەی دوو سەعات دەربارەی ئیسلام دوام، جا ئەگەر هەر بە دوو سەعات ئیسلام خستنە ڕوو، پڕوپاگەندەی شەش دانە مانگی مارکسیزم مێشکی مارکسی یەك بە جێ بێڵێ و ئیسلام شوێنی بگرێتەوە، مانای وایە ئەگەر بێت و دوو سێ مانگ شوێن کەوتوانی مارکسیزم ئیسلامیان بکەوێتە بەر گوێ، خڕایی یان لێ دەبڕێ و سەر کوێزرەکەی نەبێ بۆ مارکسیزم نامێنێتەوە !

دوای ئەم قسانە، زۆری پێ نەچوو کەڵەکە بەردی بەرماڵانی دێی (ق) مان، لـێ وەدەر کەوت و هەتا ئەمن نوێژەکەم کرد و نەختێك سامەوە و پشووم دا، ڕۆژیش گەییە سەرسوێی و، وردە وردە پارێز و دزەی کرد و دوای پێچێك خۆی کوتایە پاش شاخە بەرز هەڵچووەکان و شەوگاریش بە کەلێنی زانی و، وەك دز پارێزی هێنا و هێدی هێدی تاوڵی ڕەشی تاریکی خۆی بەسەر گوندە بێ بەخت و چارە ڕەشەکەدا کێشا و، دنیا خامۆش بوو، وەك ئاشی ئاو لـێ بڕاوی لێهات، ئەمنیش چونکە یەکجار ماندوو شەکەت و بڕست لێ بڕاو بووم، هەر دوای بەجێ هێنانی نوێژی شێوان و خەوتنان، پاڵم وە حوکمێ خوای دا و بە دڵێکی ئارامەوە لـێی نوستم.

MediaAmeerOffice

AliBapir/عەلی باپیر

AliBapirw/عەلی باپیر

AliBapir1

archive.org/details/@alibapir

AliBapir/عەلی باپیر

AliBapir

AliBapir / عەلی باپیر

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي

www.alibapir.net
کوردی - عربي - English

ڕاگەیاندنی مەکتەبی ئەمیر

# فەرهـەنگـلیـە

| | |
|---|---|
| ئاماژە | نیشارە |
| ئامالْ | مەیلەو |
| ئەستۆ | مل، گەردن |
| ئاپورە | حەشامات، کۆمەڵە خەڵکێك |
| ئاوا | بەم شێوەیە، بەم جۆرە |
| ئەزموون | تەجرەبە، جەرباندن |
| ئاخر و ئۆخر | کۆتایی |
| ئاوەڵا کردنەوە | یەکالا کردنەوە، شی کردنەوە |
| ئێچك | دارێکە بەسەری گوریسەوە دەبەسترێ، بۆ توند کردنی بار، یان کۆڵ. |
| بە ڕاشکاوی | بە ئاشکرا، بە بێ منەتی، بێ پێچ و پەنا، بە صەڕاحەت. |
| بە هەویا | بە تەما، بە ئومێد. |
| بە ئەسپایی | بە هێواشی، بە ئارامی، لەسەرەخۆ. |
| بێ ڕەزا | زەبەلاح، مەزن. |
| بریا | خۆزگە، کاشکی. |
| بە سێنایی | بە ئاسانی، بە بێ زەحمەت. |
| بەر هەست | هەست پێکراو، (محسوس). |
| بێ بڕست | بێ هێز، نا توانا |
| بەرانبەر کێ | بۆ یەك هاتنە گۆڕ |
| بە تالووکە | بە پەلە |

| | |
|---|---|
| بی بیزینێ | لە بەرچاوی بخات، بێ نموودی بکات، لە پێش چاوی ڕەش کات. |
| بەو پێ و دانە | بەو جۆرە، بەو شێوازە. |
| بە مەرەدی تۆ دەچم | وەك تۆم بەسەر دێ، بە دەردی تۆ دەچم. |
| بە تۆبزی | بە زۆری، بە زۆر ملی، بە خورتی. |
| بترۆقێنین | بدڕێن، بەهێز شتێك بگوشرێت هەتا دەپووکێتەوە. |
| بەر کوڵێك | کەمێك، نموونەیەك، لە ئەسڵ دا بەو ئەندازە کەمە دەگوترێ. |
| | کە لە چێشت دەخورێ پێش پێگەیشتنی. |
| بە کاوە خۆ | بە هێواشی، بە ئارامی، لەسەرە خۆ ، وردە وردە. |
| بۆ خاتری وەی | بۆ ئەوەی. |
| بەرین | پان. |
| بە چاوان | بە سەرچاو. |
| بەر چاو | دیتراو، بەرهەست، ئاشکرا، پەی پێ براو. |
| بەتەنێ | بە تەنیا. |
| بێ خەوش | بێ گەرد، بێ لەکە، بێ عەیب، بێ خڵت. |
| بەراوە ژوو | بە پێچەوانە. |
| بەری هەموو قسان | پێش هەر قسەیەك. |
| بیۆلۆجیا | ژیانزانی. |
| باریَ بنەوە | لای بنەوە، لای ژێرەوە. |
| بەرۆکیان دەگرێ | یەخەیان دەگرێ. |

| | |
|---|---|
| باریَ بنەوەی پیَ دەبریَ | وە بن دەکەویَ ، پشتی لە زەوی دەدریَ. |
| بیَدار | بە خەبەر، نە نووستوو. |
| بە دەردی وی بچیَ | وەك وی لیَ بەسەر بیَ. |
| بوغز و غەرەز | رِق و قین، کینە داگرتن. |
| باقلَ | توومەز. |
| بە مراد ناگا | بە ئامانج ناگات، ناگاتە مەبەست. |
| بقەبلَیَنیَ | بنرخیَنیَ، هەلَسەنگیَنیَ. |
| بە چاو دەنگیَویَ | دەبینیَ، بەدی دەکات. |
| بە شۆق | تیشك دەر، درەوشاوە |
| بە کەلَیَنی زانی | بە دەرفەتی زانی، بە هەلی زانی. |
| بە دەو | بە رِەونەق. |
| پیَیدا رِەت بیَ | پیَیدا رِابریَ، پیَیدا تیَپەرِ بیَ. |
| پەزمەندە کران | کۆ کرانەوە، خرِ کرانەوە، گرد کرانەوە. |
| پنوو | خالَ، پەلَە. |
| جلَیتاو | لیَزماو، باتلاَغ، قورِ و چلَپاو. |
| جەرگ | جگەر. |
| جەردە | رِیَ گر. |
| جویَ کردنەوە | جیا کردنەوە، هەلاَواردن. |
| چۆرتم | گیَروگرفت، تەنگ و چەلَەمە. |
| چۆمیلکە | رِووباری گچکە. |
| چەمك | واتا، مانا، (مفهوم) مەبەست. |
| چ فایدیَی نەبو | هیچ سوودی نەبوو، دادی نەدا. |
| چاتر | باشتر، چاکتر. |

| | |
|---|---|
| چاویان لیَ کردمە دریَشە | چاویان تیَ بڕیم، بە وردی سەرنجیان دام. |
| چاوان لە قووچ نەنیَ | چاوان نە نووقیَنیَ، خۆی گیَل نەکات. |
| چیدی | چیتر. |
| چما | بۆچی، لە بەرچی، لۆ. |
| چەپەر | تانە. |
| چیدی پیَ نەوەخریَ | چیتر نەخایەنیَ. |
| حەوجیَیان دەبیَ | پیَویستی پیَیان دەبیَ، سەری تیَیان دەوەستیَ. |
| حەیفیَ | بە داخەوە. |
| حەجماندن | جیَ کردنەوە، گونجاندن. |
| حەتمەن | بیَ گومان. |
| حەواڵە کردن | پیَ سپاردن، عاید کردن. |
| خەڵك هەڵدەنیَ | خەڵك هان دەدا. |
| خۆشیَك | دەسبەجیَ، یەکسەر. |
| خۆی لیَك بکیَشیَتەوە | دریَژ بخایەنیَ. |
| خەسڵەت | سیفەت. |
| خۆی ڕانویَنیَ | خۆی پیَشان بدات. |
| خۆڕانان | خۆ هەڵکیَشان، خۆ هەڵدانەوە. |
| خۆی کوشمەڵە کردبوو | خۆی ڕیَك هیَنابوو، خۆی گچکە کردبۆوە. |
| خۆی لەسەر مەفع کاتەوە | خۆی لەسەر بفەوتیَنیَ، خۆی بکاتە قوربانی. |
| خڕایی یان لیَ دەبڕیَ | کۆتایی یان دیَ، دەبڕیَن، تەواو دەبن. |
| خۆ ڕاپسکاندن | خۆ ڕاتەکاندن . |
| خۆم پیَ مەرزەم نەکرا | خۆم پیَ ڕانەگیرا. |

| | |
|---|---|
| دەبەرێك ڕاچوون | دم بە دمە کردن، لەگەڵ یەکدا ڕوو بە ڕوو بوون. |
| دەسڵەمنەوە | دەڕەونەوە ، دوور دەکەونەوە . |
| ڕق لێ هەستان | بوغزاندن. |
| دەبیەن | دەبیستن، گوێیان لێ دەبێ. |
| دۆش دادەمێنێ | دەحەپەسێ، دەستەوسان دەبێ، مات دەبێ. |
| دە گژیان ڕاچێ | دەبەریان ڕاچێ، لە گەڵیان ڕوو بە ڕوو بێ. |
| دزێو | ناشیرین، نا جوان. |
| دەم بۆ دەمێ | تاو بۆ تاوێ. |
| داری لە شاقەڵی دراوە | قەلۆش بوە، هیچی پێ نەماوە. |
| دڕ دۆنگ | دوو دڵ، گوماندار. |
| دالاش | خەرتەڵ، دالّ. |
| دارماڵ | مشت ، پڕ. |
| دەستە چیلە | ئەو گۆلمە پووشە یان چیلکەیە کە ئاگری پێ هەڵدەکرێ. |
| دەڕۆستیان نایەن | پێیان ناوێرن، دەرەقەتیان نایەن. |
| دەیان نوێنێ | بەنجیان دەکات، مێشکیان دەتەزێنێ. |
| دمە زەرد کردنەوە | تیژ کردنەوە. |
| دامنا | گریمان، فەڕزم کرد. |
| دوای پێچێك | دوای تاوێك، دوای ماوەیەکی کەم. |
| دنیا خامۆش بوو | دنیا کش و مات بوو |
| دم بە دمە | وتووێژ، شەڕە قسە. |
| دەخۆی ڕانابینێ | لەخۆی ڕاناپەرموێ. |

| | |
|---|---|
| دژایەتی | (تضاد) هەبوونی ناکۆکی و پێکەوە هەڵنەکردن. |
| دومەڵ | کوان. |
| دەتگوت لەسەر ئاوو ئاورانە | زۆر بە پەلە بو، زۆر تاڵووکەی دەکرد. |
| دەڕەخسێنێ | دروست دەکات. |
| دەی ئاژوێ | لـێی دەخوڕێ. |
| داڵدە نادەن | پەنا نادەن. |
| دەست لێ کوتان | دەست لێدان، (لمس). |
| ڕێچکان | کۆی ڕێچکەیە، ڕێچکەش بیردۆزەیەکی مرۆڤ کردە. |
| ڕیـزپەڕ | (شاذ) . |
| ڕەگەڵ خەن | بخەنە گەڵ، وەگەڵ خەن. |
| ڕۆ چوون | قووڵ بوونەوە. |
| ڕاڤە کردن | لێکدانەوە، تەفسیر. |
| ڕۆ نان | دانان. |
| ڕمێنی نەما | ڕەواجی نەما، لە برەو کەوت. |
| ڕدێن سپی | ڕیش سپی، پێشەوا، دەمڕاست. |
| ڕێشمە | جڵەو. |
| ڕاپێچەك دەر | ڕامالکەر ، ڕادەر. |
| ڕاناقەنێن | نـاکـەون. |
| ڕەگەڵ دێخین | دەخەینە گەڵ. |
| ڕێژنە باران | بارانی بە لینگێزە، تاوە بارانی بە تەوژم. |
| زەین | بیرو هۆش، ئاوەز. |

| | |
|---|---|
| زیرۆحی تێدا نیە | گیان لەبەری تێدا نیە، کەسی تێدا نیە. |
| زار | دەم. |
| زات ناکات | ناوێرێ |
| ژیوان وەبی | پەشیمان بیەوە. |
| سایکۆلۆجیا | دەروونزانی. |
| ساڵێکی ڕەبەق | ساڵێکی تەواو. |
| سپات بووەوە | سپی بووەوە، ڕەنگ چووەوە. |
| ساختە چی | کەڵەك چی، فێڵباز. |
| سەرقاڵ | سەرگەرم، مشغووڵ. |
| سوسیۆلۆجیا | کۆمەڵناسی. |
| سەر لەبەر | سەرتاپا. |
| سەودا | مامڵەت، مامەڵە . |
| ساتمە بردن | هەڵە نکووتن، لێرەدا مەبەست بە سەهووچوون و هەڵە کردنە. |
| سیپاڵ | جل و بەرگی شڕ و دڕاو و فڕێ دراو. |
| سەرچەنگ چوون | سەرەنگرێ بوون ، مەبەست بە هەڵەدا چوونە. |
| سپێر | سەنگەر. |
| سامەرە ستوو | سوور، موچڕ. |
| سپڵە | بێ نمەك، پێ نەزان، بێ وەفا. |
| سەر کوێزر | سەر کۆتەڵ. |
| سەر لێ تێکچوون | ڕێ هەڵە کردن، گومڕا بوون، سەر گەردان بوون. |

| | |
|---|---|
| سەغڵەت بوون | مەحتەڵ بوون، چارە نەمان. تووشی ناخۆش هات . |
| شەکەژۆ | ماندوو مجرۆ. |
| شتاقمان | هیچ کامان، زیاتر بۆ دووان بەکاردێ. |
| شك نابات | نیەتی. |
| شڵت و شۆ | بەفری نیوە تواوە. |
| فسیۆلۆجیا | توێکار زانی. |
| فیتی ویە | خەتای ویە، سووچی ویە. |
| فرچك پێوە گرتن | پێوە ڕاهاتن، لە ئەسڵ دا (فرچك) بەو شیرە دەڵێن کە کۆرپەی ساوا بۆ یەکەم جار دەیخوات. |
| قم دەکات | نقووم دەکات، ون دەکات ، بزر دەکات. |
| قولینچك | گۆشە، سووچ، قوژبن. |
| قیت کاتەوە | هەستێنێتەوە پێ، ڕاست کاتەوە. |
| قوڵە نەزیلە | بەسەرهاتی کورت، کورتە چیرۆك. |
| قرپۆکی | بێ نێوی، هیچ و پووچی. |
| قوتار بوون | ڕزگار بوون. |
| قەڵەمڕەو | حوکم، ژێر ڕکێف. |
| قەباحەت | تاوان، خراپە. |
| قەومان | ڕوودان. |
| قەڵس | توورە، نا سەرسەنگ. |
| قەلۆش بوون | گیرفان بەتاڵ بوون، هیچ پێ نەمان. |
| قسە بە دەست | سەرۆك، دەمڕاست. |

| | |
|---|---|
| قایل بوون | ڕازی بوون. |
| کەڕەت | جار. |
| کەندڕ | قۆڵت. |
| کڕکاتی لە خۆ بڕی بوو | بێ دەنگ بوو بوو. |
| کەمبەر | تەسك. |
| کێهە | کامە. |
| کشگێڕ | دەستەوسان کەر، (معجز). |
| گۆرین | ناو براو، تاین. |
| گچکە | چووکەڵە، بچووك. |
| گفتم پێ دابو | وەعدم پێ دابو، بەڵێنم پێ دابو. |
| گاشە | بەردی زل . |
| کرچوو تەزێن | جەرگ بڕ، پشت شکێن. |
| گەروو | قوڕگ، بین. |
| گێچەڵ نانەوە | هەرا نانەوە، کێشە بەرپا کردن. |
| لەدڵی گران هات | پێی ناخۆش بو. |
| لە گوێ چکاندن | تێ گەیاندن، حاڵی کردن. |
| لێکدا لێکدا | لە سەرێك لە سەرێك، بەردەوام. |
| لەوێ وەولای کەوێ | لەوێ بەو لاوە، لەوێ بترازێ. |
| لە بەرایی دا | لە سەرەتاوە، لە پێشەوە. |
| لە باتی | لە جیاتی، لە بری. |
| لێ وەکار خەین | لێ بخەینە کار. |
| لە سۆنگەی ئەوەوە | لەبەر ئەوەی، بەهۆی ئەوەوە. |

| | |
|---|---|
| لوێچێك | لوێچ، ئەو ئەندازەیەیە کە لە نێوان لەپی دەست و پەنجەکانی دا دەحەوێتەوە . |
| لەمێژە | دەمێکە. |
| لەو دەمەی دا | لەو کاتەی دا. |
| لە جەنگەی | لە گەرمەی. |
| لێ کەچ کردن | لێ کەم کردنەوە، لێ داشکاندن. |
| لارێ بوون | هەتڵە بوون، لادان، لامل بوون. |
| لە نووکەوە | لە سەرەتاوە. |
| لێ نافامرێتەوە | لێ وەرناگیرێ. |
| لەکن | لە لای. |
| لینگان | لاقان. |
| لێواو لێو | پڕاو پڕ، مەلا و مەل. |
| لێی وەپرینگێ | لێی بڕەوێتەوە، لێی دوور کەوێتەوە. |
| مەلۆتکە | کۆرپەی ساوای تازە لە دایك بوو. |
| موچیڕی | سووری. |
| مشوور خواردن | غەمخواردن، بە تەنگەوە بوون. |
| ناقۆلا | نالەبار، نا بەراو، نە گونجاو. |
| نالوێ | ناگونجێ، ناسازێ. |
| نکوولی لەوە نیە | ئینکاری لەوە ناکات. |
| نهۆم | قات: سێ نهۆم، سێ قات. |
| نا لێکی | ناڕێکی ، نا تەبایی. |
| نا ماقووڵ | نەگونجاو لەگەڵ ژیریدا، شتی بێ ڕێ و جێ. |
| وێك هەڵنەکەر | پێکەوە نەگونجاو، پێکەوە مەدار نەکەر. |

| | |
|---|---|
| ویڕای ئەوەش | لەگەڵ ئەوەش. |
| وێکرا | پێکەوە. |
| وەسەرخۆی نایەنێ | خۆی تێك نادات، خۆی شلوێ ناکات. |
| وێچووتر | گونجاوتر، لەبارتر. |
| وەبەر خۆدابو | گرتبۆ نێو خۆی، دایگرتبوو. |
| وەحەسێم | بحەسێمەوە، پشوو بدەم. |
| وی | ئەو، ئەڤـ . |
| وەعەرزێ کەوتوە | کەوتۆتە سەر زەوی، وەبن کەوتوە. |
| وەگەڕ خستن | خستنە ئیش. |
| وەدارێکی دەڕزێ | خەریکی دارێکیە. |
| وەسەرێك نان | کۆ کردنەوە، خڕ کردنەوە سەریەك. |
| هاڕێ لە بڕێ ناکاتەوە | هیچ لە هیچ نازانێ، سەرە دەری لێ ناکات. |
| هەربوو | بێ سەرەتا، ئەزەلی. |
| هەڵا خنەراو | پەستێوراو، پڕ کراو. |
| هەوەڵ جار | یەکەم جار. |
| هێدی هێدی | بە نەرمی، هێواش هێواش، پلە پلە. |
| هانا وەبەر بردن | پەنا بردنە بەر. |
| هەڵتریزاون | هەڵخلیسکاون، لێرەدا مەبەست بە هەڵەدا چوونە. |
| هەڵناکات | مەدار ناکات، نا سازێ. |
| هەتلە بوون | ڕێ ون کردن، لادان، سەر لێ شێوان. |
| یەکدی | یەکتر. |
| یەکەبارێ خۆم | بەش بە حالّی خۆم. |

# پێرست